# شێوەی سلێمانی زمانی کوردی

دانانی

د. زەریَ یوسوپۆڤا

وەرگێڕ لەزمانی ڕووسییەوە

د. کوردستان موکریانی

لەبڵاوکراوەکانی کۆڕی زانیاری کوردستان

هەولێر ٢٠٠٥

- ناوی کتێب:  شێوەی سلێمانی زمانی کوردی

- نووسینی: د. زەرێ ع. یوسوپۆڤا

- وەرگێڕانی لەزمانی ڕووسییەوە: د. کوردستان موکریانی

- بڵاوکراوەی کۆڕی زانیاری کوردستان ژمارە: ( ٨ )

- تیپ لێدان و دەرهێنانی هونەری: هاژە سمکۆ

- دەرهێنانی هونەری بەرگ: ئاراس ئەکرەم

- سەرپەرشتی چاپ: ئەورەحمانی حاجی مەحموود

- تیراژ: ١٠٠٠ دانە

- چاپی یەکەم - چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە - هەولێر

- ژمارەی سپاردن بە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕۆشنبیری لە هەولێر ٢٠٠٥/٢٦٠

## پێشەکی وەرگێڕ

شێوەی سلێمانی زمانی کوردی بەرهەمێکی ڕێزمانییە، لەلایەن دکتۆر زەرێ ع. یوسوپۆڤاوە لێی کۆڵدراوەتەوە و لە مۆسکۆدا لە ساڵی (١٩٨٥)دا چاپکراوە.

لەبەر گرنگی بابەتەکە و نەبوونی بەرهەمێکی سەربەخۆ سەبارەت بەهەموو بەشەکانی ڕێزمانی شێوەی سلێمانی و لەرووی ئەوەی ئەم بەرهەمە بەندیواری بە پسپۆری من هەیە و شارەزاییشم لەو زمانەدایە، کە ئەم بەرهەمە بەنرخەی پێ نووسراوەتەوە، بۆیە وام بەباش زانی ئەم کتێبە لەزمانی ڕووسێوە وەربگێرمە سەر زمانی کوردی، بۆ ئەوەی باسێکی زانستانە، بەشی زمانەوانی کتێبخانەی کوردی پڕ بکاتەوە و ڕۆشنبیرانی کورد سوودی لێ وەربگرن.

ئەم بەرهەمە بریتییە لەم بەشانەی خوارەوە: پێشەکی ـ لەم بەشەدا د. زەرێ بەکورتی لە زمانی کوردی دەدوێت، کە دەچێتەوە سەر چ خێزانێکی زمان، نێوی ئەو شوێنە جوگرافییانە دەبات، کە پێی دەدوێن، جا دێتە سەر دابەشکردنی زمانی کوردی بەسەر شێوەکانیدا و نەخشەی مامۆستا تۆفیق وەهبی و دکتۆر مەکەنزی دەخاتە ڕوو، بیروڕای خۆی بەرامبەر هەردوویان ڕوون دەکاتەوە و سەبارەت بە نەخشەکانی د. مەکەنزی تێبینێکی زۆری هەیە و باری سەرنجی خۆی زانستانە لەم بوارەدا ڕوون دەکاتەوە. هەر لەم بەشەدا بەراوردێکی فۆنۆتیکی نێوان دیالێکتی کرمانجی خواروو و کرمانجی ژووروو دەکات و لایەنی پەرەسەندووی بەشەکانی ئاخاوتن لەهەردوو دیالێکتەکەدا دەخاتە ڕوو و لە شەش خاڵ دا جیاوازی نێوان شێوەی سۆرانی و زمانی فۆلکلۆری نیمچە شێوەکانی دی کرمانجی خواروو دەچەسپێنێت.

لەم پێشەکییەدا ناوی ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییانە تۆمار دەکات، کە لە عیراق دا بە زمانی کوردی دەردەچن، هەروا نێوی ئەو ڕۆشنبیرانە تۆماردەکات، کە دەورێکی باڵایان لەپەرەسەندن و پێش خستنی زمانی کوردیدا بینیوە.

له باسی ئەلفوبێ و ڕێنووسی کوردیدا لەو ئەلفوبێیە دوواوە، کە ئەم شێوەیەی پێ دەنوسرێتەوە لەگەڵ ئەو ئاڵ و گۆڕانەی بەسەر ئەم ئەلفوبێیەدا هاتووە بۆ ئەوەی شێوەکەی دەنگەکان پڕبکەنەوە.

بەشی سێیەمی بەرهەمەکە دەربارەی فۆنەتیکە لەڕووی بزوێن و نەبزوێن و نیمچە بزوێنەوەیە، کە زانستانە لێی کۆڵیوەتەوە.

وشەکانی زمان و جۆریان و دابەش کردنیان بەسەر وشەی گشتی و وشەی تایبەتیدا بەشی چوارەمی کتێبەکەی گرتۆتەوە.

بەشی پێنجەمی بابەتەکە باسی مۆرفۆلۆژییە، کە زانستانە، لەناو، ئاوەڵناو، جێناو، ژمارە، چاوگ، کار ن ئاوەڵکار و ئامراز دەکۆڵێتەوە.

بەشی شەشەمی، کە بەشی هەرە دووایی ئەم پەرتووکەیە سەبارەت بە ڕستەیە، لایەنی سادە و نەسادەی ـ لێکدراو و تێکەڵ و ئەو ئامرازانەی هاوبەشی دارشتنیان دەکات، ڕوون کردۆتەوە. هەر لەم بەشەدا تێکستێکی یەك لاپەرەیی بە زمانی کوردی بڵاوکردۆتەوە لەگەڵ وەرگێڕانەکەی بە زمانی ڕووسی، هەروا هەندێك لە وشەکانی هەر بەزمانی ڕووسی لەڕووی ڕێزمانەوە بۆ خوێنەرانی ڕووس لێکداوەتەوە.

نووسەر لە پێشەکی بەرهەمە ڕێزمانێکەیدا دەڵێت: ***ئەو لێکۆڵینەوەی پێشکەشتان کراوە، دەربارەی شێوەی سلێمانییە و ئەمڕۆ بە پێشکەوتووترین شێوەی وێژەیی زمانی کوردی عێراق دادەندرێت*** ، بەڵام ئەوەی لە ئەنجامی خوێندنەوەو وەرگێراندا بۆم دەرکەوت ، لێکۆڵینەوەکە هەر تەنیا لە بارەی شێوەی سلێمانی نییە، بەڵکو فراوانترە و شێوەکانی دی کرمانجی خوارووشی گرتۆتەوە، بۆیە ئەگەر ناوی ***(ڕێزمانی شێوەی کرمانجی خواروی)*** لێنابا زیاتر لەگەڵ ناوەرۆکی بابەتەکەی ڕێکدەکەوت *.

---

** لەسەردانی ساڵی ١٩٩٦ ی زەریێ بۆ هۆڵەندا و دیسانەوە لە سەردانی ساڵی ٢٠٠٣ دا بۆ کوردستان، باسی یەکنەگرتنی ناو و ناوەرۆکی ئەو بەرهەمەم بۆ کرد ، ئەویش لەگەڵ ئەوەدا بوو ، کە دەبا ناونیشانی ئەو ڕێزمانەی بەردەست لەگەڵ ناوەرۆکەکەی یەکیان بگرتایا ، هەروا ئەوەی ڕوونکردەوە، کەوا لەسەرەتادا ناوی (ڕێزمانی شێوەی کرمانجی خوارووی) ی لێنابوو ، بەڵام یەکێك لە*

کەرەستەی هەڵبژاردنی وشەی کوردی ڕەسەن بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیە، ئەم چاپەمەنییە کوردییانەن، کە زۆربەیان لە عیراقدا چاپ کراون و لیستەی ناوەکانی لە کۆتایی ئەم وەرگێرانەشدا بڵاوکراونەتەوە. لەگەڵ ئەو تێبینییەی، کە لەمەوبەر باسم کرد د. زەری لەم کەرەستەیەدا ژیرانە و زیرەکانە و زانایانە بەڵگە و وێنەکانی پێویستی ئەو بابەتەی، کە ناوچەکەی هەزاران کیلومەتر لێی دوورە، هەڵبژاردووە.

بەهاری ١٩٨٨ و زستانی ٢٠٠٤

---

*هەڵسەنگێنەرانی بابەتەکەی بەو مەرجە ڕێگەی لەچاپدانی ئەو بەرهەمەی دابوو، کە ئەو ناوەی ئێستەی لێبنێت، هەر لەم ڕوانگەوە، داوای لە من کرد، کە وەرگێرانەکە بەناوی: ڕێزمانی شێوەی کرمانجی خواروی بڵاوبەمەوە، بەڵام من لە وەرگێراندا ڕێگە بە خۆم نادەم، کە تیپێک دەسکاری بکەم، نەک ناونیشانی کتێبێک.*

## پێشەکی نووسەر

زمانی کوردی بەر بەشی باکووری رۆژئاوای گروپی زمانانی ئێرانی رۆژئاوایی دەکەوێت، لەنێو هەموو خاکی کوردستان دا قسەی پێ دەکرێت، کە لە ڕووی کارگێرێوە بەسەر تورکیا و ئێران و عیراق و سوریەدا دابەشکراوە، هەروا کورد لە یەکێتی سۆڤێتیش دا دەژین، کە بە شێوەیەکی سەرەکی لەودیوی قەفقاس و لەنێوەڕاستی ئاسیا دان. ژمارەی کورد بە پێی سەرچاوە چاپکراوەکانی بێگانە و ناوخۆیی نێزیکەی بیست ملیون کەس دەبێت. (بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ١٠، لاپەرە ٣٦).

لەزمانی کوردیدا دوو کۆمەڵە دیالێکتی سەرەکی هەن؛ دیالێکتی ژوور و دیالێکتی خواروو، لە کوردناسی سۆڤێتیدا زاراوەی کرمانجی بۆ ناولێنانی دیالێکتی ژووروو بەکاردێت و زاراوەی سۆرانیش[1] بۆ دیالێکتی خواروو.

شێوەی ژووروو لە کوردستانی تورکیادا (ناوچەی دیاربەکر، هەکاری، بتلیس، مووش، وان، ئەرزەڕووم و خەرپووت و هی دی)دا قسەی پێ دەکرێت، هەروا لە کوردستانی ئێران (خۆراسان و ئەو هەرێمانەی دەکەونە ڕۆژئاوای گۆمی ورمێ) و لە کوردستانی عیراق دا (ناوچەی مووسل، ئاکرێ، زاخۆ، ئامێدی، دهۆك، چیای ژەنگار و هی دی) و لە سوریا (ناوچەی قامیشلی، حەسەکە، کورد داخ) و لەیەکێتی سۆڤێتیش دا بەم دیالێکتە دەدوێن.

دیالێکتی خواروو لە کوردستانی ئێران (ناوچەی مەهاباد، سەکز، بۆکان، سەردەشت، سنە، کرماشان و هی دی) و لە کوردستانی عیراق دا لە (ناوچەی هەولێر، ڕەواندوز، سلێمانی و کەرکووك و هی دی قسەی پی دەکەن. (بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ٧، لاپەرە ٢٠)

ئەو لێکۆڵینەوەیەی پێشکێشتان کراوە، دەربارەی دیالێکتی سلێمانییە و ئەمرۆ بە پێشکەوتووترین شێوەی وێژەیی زمانی کوردی عیراق دادەندرێت، ئەم دیالێکتە، کە لە ساڵی (١٩١٨)ەوە بە زمانێکی ڕەسمی کوردستانی عیراق (ناوچەی سلێمانی)

ژمێردراوه، زۆربەی بەرهەمەکانی دەرەوەی (مەبەستی نووسەر دەرەوەی یەکێتی سۆڤێتە ـ وەرگێڕ) پێ چاپ دەکرێت.

شێوەی سلێمانی (کە لەمەودووا هەر زاراوەی سلێمانی بۆ بەکاردێنم) بەر دەستەی دیالێکتی خواروو دەکەوێت، کە لە بناغەی فۆنۆتیکی و ڕێزمانیدا کۆمەڵێك تایبەتێتی تێدا بەرچاو دەکەوێت و بەو هۆیەوە لە دیالێکتی ژووروری جیادەکاتەوە.

لەبواری ئێرانی ناسیدا هێشتا بیروڕایەکی یەکگرتوو دەربارەی دیالێکتەکانی زمانی کوردی بەدی ناکرێت. بیروڕای زانایان دەربارەی ئەو بەشانەی دیالێکتەکانیان لێ پێك هاتوون و هەروا ناونیشانیان جیاوازی هەیە.

هێندێك لە لێکۆڵەوەران، کە زانایانی کوردیشیان بەر دەکەوێت، زمانی کوردییان دابەش کردۆتە سەر چوار دیالێکت: کرمانجی لوڕی، گۆرانی[٢] و زازا. (بڕوانە نەخشەی ژمارە ـ ١). بەپێی ئەو دابەش کردنەی، کە زۆربەی فیلۆلۆژییانی ئێرانی پەسەندیان کردووە، سلێمانی بەر گروپی کرمانجی خواروو دەکەوێت (٥٣).

## نەخشەی ژمارە (١)

**دابەش کردنی زمانی کوردی بەسەر دیالێکتەکان دا لەلایەن تۆفیق وەهبی‌یەوە**

دابەشکردنی زمانی کوردی بەسەر دیالێکتەکاندا لەم ساڵانەی دواییدا لەلایەن زانایانی کوردی عیراقەوە لەگەڵ ئەو دابەشکردنەی پێشوودا جیاوازی هەیە. بۆ وێنە محەمەد ئەمین هەورامانی ـ نووسەری ڕێزمانی بەراوردکاری نێوان دیالێکتی سۆرانی و هەورامانی (٦٣) زمانی کوردی دابەش کردۆتە سەر سێ دیالێکت: کرمانجی ژووروو (بادینانی)، کرمانجی نێوەڕاست (سۆرانی) و کرمانجی خوارووی (گۆرانی)، کە دیالێکتی هەورامانی و باجەڵانی و زازا و لوڕی (لەکی) دەگرێتەوە.

فوئاد حەمە خورشید (٦٠) زمانی کوردی کردۆتە چوار دیالێکت: کرمانجی ژووروو، کرمانجی نێوەڕاست، کرمانجی خواروو و گۆرانی؛ کە ئەوەی دواییان دیالێکتی هەورامانی و باجەڵانی و زازای گرتۆتەوە. بەپێی ئەم دابەش کردنە و ئەوەی پێشووش سلێمانی کەوتۆتە نێو گرۆپی نێوەڕاست.

ئێرانی ناسی ئینگلیز ـ د. ن. مەکەنزی زمانی کوردی دابەش کردۆتە سەر سێ دیالێکت: ژووروو، نێوەڕاست و خواروو. (بڕوانە نەخشەی ژمارە ٢)

دیالێکتی زازا، لوڕی و گۆرانی نەخستۆتە نێو گروپەکانی زمانی کوردی. لێرەدا پێویستە ئەوە بگوترێت، کەوا ئەم بیروڕایەی د. ن. مەکەنزی دەربارەی زازا و لوڕ و گۆران تازە نییە، چونکە لەپێش ئەودا لەلایەن هێندێک نووسەری سۆڤێتییەوە باسکراوە بڕوانە (سەرچاوەی ژمارە ٢٤ لاپەرە ٤)، هەروا لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا لەلایەن زانایانی ڕۆژئاوای وەك ئۆسکار مان و ك. هەدەنگ (٤٥؛ ٤٦)، ئا. کریستنسن (٣٩؛ ٣٦) و کەسانی دییەوە باس کراوە. ئەگەرچی ئەم دیالێکتانە لەلایەن ئەم نووسەرانەوە بەتەواوی و بەقووڵی لێیان نەکۆڵدراوەتەوە و لەگەڵ دیالێکتەکانی دی زمانی کوردیدا بەراوردنەکراون، کەچی لە ئەنجامیشدا هەر خۆیان دەیانبەنەوە سەر زمانانی گروپی باکووری ڕۆژئاوا.

د. ن. مەکەنزی هەوڵی داوە ئەم بیروڕایەی خۆی بچەسپێنێت، ئەویش لەنێو چوارچێوەیەکی یاسای زمانەوانیدا، بەهۆی هێنانەوەی چەند نیشانەیەکی فۆنۆتیکی و مۆرفۆلۆژی بۆ جیاکردنەوەی دیالێکتی سۆرانی لە دیالێکتی کرمانجی، لەو نیشانانە:

نیشانەی ناسیاری، هەروا وشەی لێکدراوی ئاوەڵە، گەردانکردنی کاری نادیار و جێناوی کەسی لکاو.

### نەخشەی ژمارە (٢)

### نەخشەی دیالێکتەکانی زمانی کوردی بەپێی دابەش کردنی د. ن. مەکەنزی

| ژووروو | بایەزیدی<br>هەکاری<br>بادینانی | دیاربەکر<br>بۆتان<br>ژەنگار | زازا |
|---|---|---|---|
| نێوەراست | موکری | سۆران | |
| | ئەردەلان<br>(هەورامی) | سلێمانی | |
| خواروو | (گۆران)<br>کرمانشا<br>لەك | زەنگەنە | |

لێکچوونی دیالێکتەکانی نێوەراست لەگەڵ دیالێکتی گۆرانی لەرووی ئەم نیشانانەوە، دەباتەوە سەر ئەوەی کەوا لە گۆرانەوە وەرگیراوە، بەڵام کەرەستەی زمانەوانی ئەوە پێشان دەدات، کەوا ئەم نیشانانە لەنێو دیالێکتی کرمانجی ژووروشدا بەرچاو دەکەون، وەك نیشانەی ناسیاری ( ـ ەکە)، کە لە دیالێکتی گۆران و دیالێکتەکانی نێوەراست دا یەکن و لەنێو هێندێك لە بەشەکانی دیالێکتی ژووروشدا بەکاردێت، ئەم بەکارهاتنەش هەر لەنێو ئەو تێکستانەدا هەن، کە د. ن. مەکەنزی خۆی بۆ وێنەی دیالێکتی کرمانجی و سورچی و ئاکرێی (٤٤، بەرگی ـ ٢) هێناوەتەوە. هەر لێرەدا پێویستە لەگەڵ ئەو ڕایەی ر. ل. تسابۆلۆف دا نەبین، کە هەمان تیبینێکەی

مەکەنزی دووپات دەکاتەوە، کەوا باری ناسیاری و نەناسیاری هەتا بەشێوەیەکی نادیاریش لەنێو ئەو دیالێکتانەی زمانی کوردیدا بەدی ناکرێت (٢٥، لاپەرە ـ ١)، ئەم بابەتە باسکراوەی نووسەر لەسەر بنکەیەکی ڕاستی زمانەوانی بنیات نەندراوە و لە واقیعی زمانەکە دوورە، ئەم جۆرە کێشەیەی ناسیاری و نەناسیاری لەبواری دارشتنی رێزمانیدا باس دەکرێت و لەنێو هەموو دیالێکتەکانی زمانی کوردیدا هەن (بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ٢؛ ٧؛ ٢٦؛ ٦٣).

نیشانەی دی هاوبەشی نێوان گۆرانی و دیالێکتەکانی نێوەڕاست، کە بە بیروڕای د. ن. مەکەنزی لە دیالێکتی ژووروودا نییە، دارشتنی وشەی لێکدراوی ئاوەڵەیە، کە (لەلایەن ئێمەوە وەکو وشەیەکی لێکدراوی دیارخەری جۆراوجۆر باسکراوە)، ئەم وشە لێکدراوەش لەنێو هەموو دیالێکتەکانی زمانی کوردیدا هەیە و دیالێکتی گۆرانیش یەکێکە لەوان، بڕوانە (سەرچاوەی ژمارە ٢؛ ٧؛ ١١؛ ٢٦).

جێناوی نیشانەش لەو بارانەن، کە د. ن. مەکەنزی باسیکردوون و لەو ڕایەدایە، کەوا لەنێو دیالێکتەکانی نێوەڕاستدا و لەنێو دیالێکتی گۆراندا لەچاو دیالێکتی ژووروودا کەمتر بەکاردێت ( ١١، لاپەڕە ١٧٠).

د. ن. مەکەنزی دوا بەدوای کارەکەی ئۆسکارمان دا لای وایە بوونی باری کاری بزر بە یارمەتی (ر)یّ لەنێو دیالێکتەکانی نێوەڕاستدا باری پەرەسەندووی لەسەر ( ـ ی) دامەزراو، کە دەڵێت ئەم جۆرە دارشتنەی کاری بزر بە یارمەتی (ـ ی) هێشتا لەناوچەی ئەردەڵاندا هەر بە شێوەی سەرەتایی خۆی پارێزراوە و ماوە و بەکاردێت، د. ن. مەکەنزی هەبوونی ئەم دیاردەیەش هەر دەباتەوە سەر ئەوەی لە گۆرانییەوە وەرگیرابن ( ١١، لاپەرە ١٦٨) لێرەدا پێویستە ئەوە روونبکرێتەوە، کەوا ئەو کارە تێنەپەڕانەی کۆتاییان بە (یا) دێت لەدیالێکتی کرمانجی ژووروش دا بەرچاو دەکەوێت، کەواتە ئەم بارە بە پێچەوانەی بیروڕایەکی مەکەنزییەوە. ئەم بارە گشتییە لە سۆرانیش دا هەیە، کە کۆتایی بە (ا) دێت، کەواتە هەرسێ دیالێکت ـ کرمانجی ژوورو و گۆرانی و سۆرانی لەم بارەدا یەك دەگرنەوە. هەروا شوێنەواری دێرینی

هەورامان (٧٩) ئەمە ڕوون دەکاتەوە، کەوا ئەو پاشگرانەی لەکاردا بەکاردێن لە دیالێکتی کرمانجی و سۆرانیدا لەم دیالێکتەش دا هەن. دووا نیشانەی، کە د. ن. مەکەنزی دەربارەی یەکبوونی دیالێکتی نێوەڕاست و گۆرانی دا بەوێنە هێناویەتێوە، جێناوی کەسی لکاوە، لێرەدا نووسەر خۆی دان بەوەدادەنێت و دەڵێت ((لەم بارەدا نابێت باسی وەرگێران بکرێت)) ئەگەرچی جێناوی لکاوی کەسی لەنێو دیالێکتەکانی نێوەڕاست دا پارێزراوە، کەچی د. ن. مەکەنزی هێندێك ڕێکەوتی زمانەوانی ڕوون دەکاتەوە لەدیالێکتی خوارووو و دیالێکتی گۆرانی دا، کە نووسەر بەدیالێکتێکی زمانی کوردی دانابێت. لەگەڵ ئەو کێشەی دۆخ دا ئەو ڕاستییە دەخرێتە بەرچاو، کەوا ئەم جێناوی لکاوە لە زمانێکی ترەوە نەهاتۆتە نێو زمانی کوردێوە (٢٥، ل ٢٨) لەبەر ئەم هۆیانە:

یەکەم) جێناوی لکاو ئەگەرچی لەهەموو بارێك دا نا، بەڵکو لەهێندێك باردا لەنێو دیالێکتەکانی ژووروی زمانی کوردیشدا بەرچاو دەکەوێت (بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ٤٤، بەرگی دووەم).

دووەم) جێناوی لکاو هاوبەشی زۆربەی بەشەکانی ڕێزمانی لەنێو دیالێکتی نێوەراست دا دەکات، لەوانە هاوبەشی کردنی مۆرفۆلۆژی لەکاتی گەردان کردنی کاری ڕابوردووی تێپەڕدا و هەروا بەشداری لە داڕشتنی وشەی لێکدراودا لەگەڵ جێناوی خۆیی و لەگەڵ ئەوانەش دا لەنێو ڕستەدا دەوری سینتاکس خۆی دەگێرێت و هتد.. کە ئەم بارانە هەموو بەڵگەی هەبوونی جێناوی لکاون لە زمانی کوردی دا.

بەم جۆرە ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە، کەوا ئەو نیشانە ڕێزمانییانەی د. ن. مەکەنزی پێشانی داون بۆ ئەوەی بەهۆیانەوە سنوورێکی زمانەوانی لەنێوان دیالێکتی گۆرانی و دیالێکتەکانی دی زمانی کوردیدا دابنێت، بەپێچەوانە بوون بە بەڵگەی بوونی دیالێکتی گۆرانی بە موڵکی زمانی کوردی، ئەو ڕاستییە زمانەوانییەی لێکچوونی ئەو نیشانانەی نووسەر بەوێنەی لێك جیابوونەوەی دیالێکتەکانی زمانی کوردی

هێنابوونێوه دەمان گەیەنێتە ئەنجامی یەکبوونی ڕێزمانی دیالێکتەکانی زمانی کوردی و کاریگەری دیالێکتی کرمانجی خواروو بۆ سەر دیالێکتی گۆرانی[٤]

ئەو نیشانە فۆنۆتیکیانەی وەك:

$$( v / w < {}^{*}xm , şm , ç < ş )$$

لەکاری چوون دا و هەروا سەرەتای $^{*}x$ > k کە د. ن. مەکەنزی بەوێنە هێناونێوە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە، کە گۆرانی و زازا[٥] بەر زمانی کوردی ناکەون (بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ٤٣؛ ١١) چونکە ئەم دەنگانە لەنێو دیالێکتەکانی دی زمانی کوردیدا بەرچاو ناکەون.

د. ن. مەکەنزی لەنێو هەموو دەنگەکانی زمانی کوردیدا هەر تەنیا سێ دەنگ جیاوازی جیاکردۆتەوە بۆ ئەوەی بیکاتە بەڵگەی لێك جیابوونەوەی دەنگەکانی زمانی کوردی، بەڵام باسی ئەم هەموو دەنگە وێك چوونە ناکات، کە لەنێو دیالێکتەکان دا هەن و وەکو یەك وان بۆ ئەوەی بە بەڵگەی وێکچوونیان بژمێرێت، کەچی تەنیا سێ دەنگی لێك نەچووی کردۆتە بنەمای جیابوونەوەیان.

تا ئێستە دوو بیروڕا سەبارەت بە دیالێکتەکانی زمانی کوردی هەن، یەکێکیان لەگەڵ ئەو باوەڕەدایە، کە دیالێکتی گۆرانی و زازا و لوڕی سەر بە زمانی کوردین، ڕای دووەم لەگەڵ ڕای یەکەم دا نییە و ئەم دیالێکتانەی (گۆرانی و زازا و لوڕی) بە زمانانی سەربەخۆی ئێرانی دادەنێت، بۆ گەیشتن بە ئەنجامێکی بنج بڕی ئەم کێشەیە، پێویستی بەلێکۆڵینەوەی تایبەتی و سەربەخۆ هەیە، ئەگەرچی ئەو لێکۆڵینەوانەی لەسەر زازا و گۆرانی کراون (بڕوانە سەرچاوەی ٨، ٤٨، ٤٩، ٦٣) هەروا چاپکراوانی دەرەوەی وڵات (بڕوانە سەرچاوەی ٧٦ ـ ٨٠؛ ٨٣) ئەو بناغەیەمان بۆ دەچەسپێنێت بۆ ئەوەی بلێین ئەمانە دیالکتی جۆراوجۆری زمانی کوردین.

بۆ لێکۆڵینەوە لەم بوارەدا پێویستە بە پێوانەی زمانەوانی کاربکرێت تاوەکو بتواندرێت شوێنی دیالێکتی زازا و گۆرانی لەنێو دیالێکتەکانی دی زمانی کوردیدا بەدیاربخرێت[٦]، بۆ گەیشتن بەم ئامانجە دەبێت هەموو لایەنێکی دیالێکتی گۆرانی و زازا

شی بکرێتەوە، تاوەکو لایەنە لێك چوو و لایەنە لێك نەچووەکانی ئەم دیالێکتە لەگەڵ دیالێکتی کرمانجی و سۆرانی دا بەراورد بکرێت.

ئەگەر لایەنە جیاوازەکانی نێوان دیالێکتی خواروو (سۆرانی) و دیالێکتی ژووروو (کرمانجی) بخەینە بەرچاو برێتی دەبێت لەم بارانەی خوارەوە:

دەنگی دیفتونگی وەك (وا، وێ، وی) و لە نەبزوێنەکان دا دەنگی (ڵ)ێی گران و (ل)ی سووك، نەبوونی دەنگی ( چ) ی قورگ و دەنگی ( ڤ)ی لێوی ـ زمانی و دەنگی قورگی پ، ت، ك .

دیالێکتەکانی خوارووش لەنێوان خۆیان دا کەمێك جیاوازییان لە دەنگەکانیان دا هەیە، بۆ وێنە بەشێوەیەکی فراوان دەنگی (و، ر، ت) خراونەتە نێوان دوو بزوێنەوە: هاتوو (و)ە، بلێـ(ر)ەوە، چوو (و)ە(ت)ەوە، هەروا دەنگی (ك، گ)ی نێوەڕاستی زمان، کە دەکەونە پێش بزوێنەوە دەنگیان دەگۆڕێت:

ڕووناکی، کێ، کوێ. دەنگی (ن)ی پشتەوەی زمان شێوەیەکی تایبەتی هەیە لەنێو هێندێك وشەی وەك مانگ، کانگا و هتد[٧].

دیالێکتەکانی خواروو لەبواری ڕێزمان دا زیاتر هەنگاویان ناوە، بەتایبەتی لەگەردان کردنی ناودا سووکتر بووە، هەروا لە جیاکردنەوەی رەسەن لەنێو هەموو شێوەکانیدا نەماوە (کە لەدیالێکتی ژووروودا لە دۆخی تیان و خستنەسەردا بەرچاو دەکەوێت)[*].

نیشانەی کۆ (ـ ان) کە بۆ کۆکردنەوەی ناو بەکاردێت، ئێستە بەکارهێنانەکەی بەم شێوەیە تەسك بۆتەوە و لەبرێتی ئەو شێوەی نوێی کۆ (ـ ەکان) وەیا (ـ انە) بەکاردێت (بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ـ ١٨)، پێوەلکانی نیشانەی ناسیاری ( ـ ەکە) بە کۆتایی ناوەوە بەتایبەتێتێکی دی دیالێکتی کرمانجیی خواروو دەژمێردێت، کە بەزۆری بەکاردێت.

جیاوازێکی دی سەرنج ڕاکێش بەکارهێنانی ئامرازی پێوەندی سادەی (- لێ، - پێ، - تێ)یە، کە جێناوی لکاوی ( - ێ) دەتوانێت جێگەیان بگرێتەوە (بڕوانە بابەتی جێناوی لکاوی - ێ).

لەشێوەی دروست بوونی کاری کارا بزر ( کە لەگەڵ شێوەکانی شیکردنەوەی کرمانجیدا جیاوازە) پێویستە سەرنجی گەردان کردنی بکەرەکان بدرێت، لەگەڵ کاری رابوردووی تێپەڕدا (لەگەڵ جیاوازی گەردان کردنی کراوی کرمانجیدا) بارەکانی جۆراوجۆری دەمکاتی ئیلزامی و دەمکاتی بکەری و کراوی و لە کۆتاییدا بەزۆری بەکارهێنانی ( - ەوە) کە ئەرکی دارشتن وشەی نوێ و گۆرینی مانای وشەی هەیە.

ئەرکی زۆری جۆراوجۆری جێناوی لکاو لە تایبەتیە هەرە گرنگەکانی دیالێکتی خواروەوە.

جیاوازی دیار و ئاشکرای نێوان دیالێکتی ژوورو و دیالێکتی خوارو لەڕووی ووشەی فەرهەنگیش دایە.

لێرەدا پێویستە ئەوە بگوترێت، کەوا ئەو نیشانە هەڵبژاردراوانەی جیاوازی نێوان هەردوو دیالێکتەکە دوا نیشانەی بریاردراونین، چونکە هێژ ئەم نیشانانەی جیاوازی بە تەواوی لێیان نەکۆڵدراوەتەوە و ئەوەی شایەنی باسە هێندێك لەو نیشانانە ، کە تایبەتن بە دیالێکتێك لەنێو شێوەیەکی دی دیالێکتی دیدا بەرچاو دەکەوێت و بەکاردێت. لەتایبەتێتیکانی دیالێکتی ژوورو دارشتنی (ئۆبێکتی)یە، کە لەدیالێکتی خوارو لەناوچەی سلێمانیدا بەشێوەیەکی ناریکی بەکاردێت، بەکارهێنانی ( - ی) بۆ دارشتنی ناوی بکەر لەنێو ناوچەی سلێمانیدا بەرچاوناکەوێت، بەڵام لەوانەیە لەبەشە دیالێکتی تری خواردوودا وەکو سۆرانی بەکاربێت. پاشگری (- ڕا) تایبەتە بەدیالێکتی ژوورو کەچی لەبەشە دیالێکتی موکری و سۆرانیدا بەکاردێت، بەڵام لەبەشە دیالێکتی سلێمانیدا بەکارنایەت.

ئەگەر دەربارەی جیاوازیی سەرەکی نێوان بەشە دیالێکتی ئەدەبی سلێمانی و بەشە دیالێکتەکانی دی وەك سۆرانی بەتایبەتی بەشی نێوەراستی لەڕووی تێکستە

فۆلکلۆرێکانێوە (بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ٨٧؛ ٨٩، ٩٠، ٩٤) وردبێنەوە و بەراوردی بکەین لەگەڵ شێوەی وێژەیی سلێمانیدا ئەم جیاوازییانە بەرچاو دەکەون:

١ـ هەبوونی دۆخی تیان لەگەڵ ناودا: *( ـ ی)* بۆ ناوی نێری تاک *( ـ ێ )* بۆ ناوی مێی تاک *( ـ ی)* بۆ ناوی کۆتایی هاتوو بە نیشانەی نەناسیاری وەیا نیشانەی ناسیاری بێ ئەوەی سەر بە هیچ رەسەنێك بێت.

٢ـ هەبوونی باری تیانی جێناوی کەسی سێیەمی تاك *(ـ ە) وی* بۆ نێر و *(ـ ە) وێ* بۆ مێ.

٣ـ هەبوونی ئامرازی ـ ێ ، ـ *ئیی* بۆ ناوی مێ و ـ بیدە بۆ ناوی نێر.

٤ـ بەکارهێنانی ناوی کراو لەکاتی ڕابوردوودا، کە کۆتایی بە *(ـ ی)* و *(ـ گ)* هاتووە بەرامبەر بەشێوەی *(ـ وو، ـ و)ی* سلێمانی.

٥ـ بەکارهێنانی *( ـ ت وەیا ـ یت)* بۆ کاری ڕانەبوردوو و داهاتووی کەسی سێیەمی تاك بەرامبەر بە *ـ ێ (ت)ی* سلێمانی.

٦ـ بەکارهێنانی ئامرازی پێوەندی *وە، لۆ، دە، ڕە،* لەگەڵ پاشگری *(ـ ڕە)* دا.

لەبواری فۆنۆتیکیش دا ئەم ئاڵ و گۆڕانە بەرچاو دەکەوێت:

١ـ گۆکردنی ( ر )ێ لە برێتی ( ڵ)ی گران وەك لە وشەی (ماڵ ـ مار) دا هەیە.

٢ـ گۆڕینی دەنگی ( ع )ی بە ( ح )ێ وەك لەوشەی ( عەبا ـ حەبا ) دایە.

٣ـ گۆڕینی دەنگی ( چ ) بەدەنگی (س) وەك ( دەچتە ـ دەستە) // دەچێت.

٤ـ گۆڕینی دەنگی (ق)ی بە (ك)ێ (لق ـ لك) و نەمانی دەنگی ( د، ت) نێوان ددان.

ئەو بابەتانەی لەمەوبەر باسکران، ئەوە ڕوون دەکەنەوە، کەوا پێوەندیی نێوان دیالێکتەکانی زمانی کوردی هێشتا بەتەواوی لێیان نەکۆڵدراوەتەوە و لە قۆناغی ئەمڕۆش دا هەموو بەشەکانی زمانی کوردی بەباش شی نەکراوەتەوە و دیراسەت نەکراوە، باشترین ڕێگە بۆ دابەشکردنی دیالێکتەکانی زمانی کوردی وا چاکترە بەهۆی هەبوون وەیا نەبوونی جێناوی لکاوەوە بێت لەنێو دیالێکتەکان دا لەسەر ئەم نیشانە

سەرەكی‌یە زمانی كوردی دابەش دەكرێتە سەر دوو گروپی سەرەكی: دیالێكتی ژووروو (كە لە توركیا و سوریا و عیراق و ئێران)دا قسەی پێ دەكرێت و دیالێكتی خواروو (لە عیراق و ئێران) دا پێی دەدوێن. دیالێكتی زازا لە (توركیا) و گۆرانی (عیراق و ئێران)، كە ئەم دووانەی هەرە دوایی لەڕووی گەڕانەوەیان بۆ كامە دیالێكت هێشتا گفتوگۆی لەسەرە، بەڵام لەبەر ڕۆشنایی پێوانەی ئەو باسانەی لەمەوبەر ڕوون كرانەوە زازا بەر دیالێكتی ژووروو و گۆرانی بەر دیالێكتی خواروو دەكەون.

بەم دیالێكتە كوردییانە بەرهەمێكی زۆر نووسراوەتەوە و چەند سەدەیەكیش بەسەر نووسینیدا تێپەڕیوە (بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ١٥، ٢١، ٨١، ٨٢). بۆ وێنە بە دیالێكتی زازا و هەروا بە دیالێكتی كرمانجی ژووروو لە سەدەكانی نێوەڕاست دا بەرهەمێكی هۆنراوەیی زۆر دەوڵەمەند لەلایەن ئەم شاعیرانەوە هۆنراوەتەوە و بەجێماوە، وەك عەلی حەریری (سەدەی ١١)، فەقێ تەیران (سەدەی ١٤)، مەلای جزیری (سەدەی ١٥) مەلای باتەیی (سەدەی ١٥) ئەحمەدی خانی، سەلیم سلێمان، حارسی بتلیسی (سەدەی ١٧) و هی دی.

ئەو بەرهەمانەی بەدیالێكتی زازا نووسراونەتەوە و پارێزراون زۆربەیان فۆلكلۆرین (چیرۆك ، پەند ، قسەی نەستەق و گۆرانی دلّداری و پاڵەوانی) هەروا دەستنووسی بابەتی ئاینیشیان هەیە و هەڵگیراوە. (بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ٨).

بەدیالێكتی گۆرانیش بەرهەمێكی زۆر ماوەتەوە، كە بۆ ماوەی چەند سەدەیەك زمانی میرنشینی ئەردەلان بووە (بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ١٥) هەروەكو چۆن هۆنراوەی دلّداری لەدیالێكتی ژوورووا باو بووە، هەروا لە دیالێكتی گۆرانیشدا هەبووە و بەرهەمی ئەم كەڵە شاعیرانە شوێنی دیاریكراوی خۆیان گرتووە لەبواری هۆنینەوەی ئەم جۆرە بابەتەدا و بە مامۆستای هۆنراوەی دلّداری (غەزەل) سەردەمی خۆیان دەژمێردرێن. لەدیالێكتی گۆرانیدا شاعیرانی سەدەی هەڤدەم ئەمانە بوون: شێخ ئەحمەدی تەختی، مەلا تاریەی هەورامانی، محەمەد قولی سلێمان، مەلا مستەفای بێسارانی و لەسەدەی (١٨) هەژدەمدا: ئەحمەد بەگی كۆماسی، میرزا شەفیع

جەمارێزانی، رەنجوری، لە سەدەی نۆزدەم دا: مەولەوی، وەلی دێوانە، سەیدی، جەفایی، فەقێ قادری هەمەوەندی و هی دی. دیوانی ئەم شەش شاعیرانەی هەرە دووایی و داستانی رۆمانتیکی (شیرین و خوسرەوی) خانای قوبادی (سەدەی ١٨) لەلایەن زانایانی کوردی عیراقەوە چاپکراون (بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ٧٦ ـ ٨٠)

بەدیالێکتی گۆرانی بەرهەمێکی زۆری ئاییینی هەیە، کە بابەتەکانی بریتین لە سروودی ئاییینی، هۆنراوە دەربارەی چۆنیەتی پەیدابوونی کەون، نوێژ و نزا ، ژیان و بەسەرهاتی پیاوچاکان. ئێران ناسی نێودار م. موکری (بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ٤٩) راژەیەکی دیاریکراوی پێشکێش کرد بە چاپکردنی بابەتە دینێکانی دیالێکتی گۆرانی.

بەرهەمێکی گرنگ بەدیالێکتی موکریش نووسراوەتەوە، کە بە هۆیانەوە ناوی ئەم شاعیرانەی خوارەوە بە نەمری مانەوە، وەك: ئەحمەد کۆری موکریانی (سەدەی هەژدەهەم)، ئەدەب (١٨٠٦ ـ ١٨٧٦)، میرزا رەحیمی وەفایی ( ١٨٣٨ ـ ١٨٩٩)، مەلا عبدالرحمن شوان ( ١٨٥٦ ـ ١٨٩٦) سەید رەشید (شەهید) (١٨٥١ ـ ١٩٣٣)، میرزا سەلیم سابلاخی (سەدەی نۆزدەم) وهی دی. لەشاعیرە نێودارەکانی ئەمرۆی ئەم دیالێکتە. ئەورەحمان هەژار (وەرگێری شەرەفنامەی شەرەفخانی بتلیسی لەزمانی فارسیەوە بۆسەر زمانی کوردی)، هەروا خالەمینی بەرزنجەیی، هەمینە، خالیدی حوسامی و هی دی.

لەدیالێکتی خواروو ـ شێوەی سلێمانیدا بەرهەمێکی دەوڵەمەندی هونەری و زانستی و وێژەیی هەیە. لەم دە ساڵانەی ڕابوردوو لەعیراقدا دیوانی ئەم شاعیرە کلاسیکیانە چاپکرا: نالی (١٨٠٠ ـ ١٨٥٦)، سالم ( ١٨٠٥ ـ ١٨٦٩)، کوردی (١٨١٢ ـ ١٨٥٠)، حاجی قادری کۆیی ( ١٨١٦ ـ ١٨٩٧)، هەروا دیوانی شاعیرانی ئەم سەردەمەش وەك: پیرەمێرد، سەلام، گۆران، زێوەر، بێکەس، دڵزار و هی دی. بەرهەمێکی زۆری میللیش بەچاپ گەیندراوە، هەر بەم شێوەیە بەرهەمێکی زۆری کۆمەلایەتی ـ ڕامیاری، وێژەیی، زانستی، کە لەم بارانەی ئەمرۆی کوردی عیراق دەدوێت بلاوکراوەتەوە.

ئـەم چاپەمەنییانـەی خـوارەوە ئێسـتە لەلایـەن کـوردی عیراقـەوە پـەخش و بڵاودەکرێنەوە:-

١- هاوکاری - ڕۆژنامەیەکە کۆمەڵایەتی، ڕامیاری، وێژەیی هەفتانەیە، بەغدا.

٢- بەیان گۆڤارە و زمانی حاڵی وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنە، بەغدا.

٣- ڕۆشنبیری نوێ - گۆڤارێکی وێژەیی ڕۆشنبیری، بەغدا

٤- پەروەردە و زانیست - گۆڤارێکی پەروەردەیی فێرکردنی لاوانە، بەغدا.

٥- کاروان - لەلایەن ئەمینداریێتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوان (بەزمانی کـوردی و عـەرەبی دەردەچێت)، بەغدا

٦- نووسەری کورد - گۆڤاری یەکێتی نووسەرانی کوردە، بەغدا.

٧- ڕۆژی کوردسـتان - گۆڤـاری کۆمەڵـەی ڕۆشنبیری کوردییـە (بـە زمـانی کـوردی و عەرەبی بڵاو دەکرێتەوە) بەغدا.

٨ - زانکۆ - گۆڤاری زانکۆی هەولێرە (بەزمانی کوردی و عەرەبی چاپ دەکرێت) هەولێر.

٩ - پاشکۆی ڕۆژنامەی عـیراق - پاشـکۆیەکی مانگانـەی کـوردی ڕۆژنامـەی عـەرەبیی (عیراق)ە، بەغدا.

دەستەی کـوردی سـەر بـەکۆری زانیـاری عـیراق مـەزنترین مەڵبـەندی زانیـاری کوردستانی عیراقە، کارگێڕانی کاری مەزنی لێکۆڵینەوەیی جێبـەجێ دەکـەن، لـەبواری وێژە، زمـان و مێـژووی کـوردەوە، شـوێنەواری وێژەیـی و مێژوویـی (بـە دیالێکتـەکانی زمانی کوردی) تێدا چاپ دەکرێت.

بەرهـەم هێنـانی هونـەری و کـاری زانسـتی و کۆڤـار دیسـانەوە وێـژە و زانسـتی کۆمەڵایـەتی ڕێکخراوەکـانی سـلێمانی و هـەولێریش دەگرێتـەوە. لـەپاڵ چـاپکردنی بەرهەمی شاعیرانی کورددا بەرهەمی وەرگێڕاوی ڕووسی و ڕۆژئاوایی کلاسیکیش چـاپ دەکرێت، وەك بەرهەمی : پوشکین، چێخـۆف، دوستۆیۆفسـکی ، گۆگـۆل، تۆرگێنیـڤ، شەکسپیر، موپاسان، بەلزاك و هی دی.

بەرهەمی کوردانی یەکێتی سۆڤێت شوێنی دیاری کراو و تایبەتی خۆی لەنێو بڵاوکراوەکاندا هەیە. گرنگترین بەرهەمی چاپکراو لەعیراقدا بابەتی : فەرهەنگ ، دیوانی شیعر، فۆلکلۆر، لێکۆڵینەوەی زانستی دەگرێتەوە ، کە بە هەوڵ و کۆششی تاکەکەسی رووناکبیرانی کورد : مەلا عبدالکریم مدرس، گیوی موکریانی، علاءالدین سجادی، شێخ محەمەدی خاڵ و محەمەدی مەلا کەریمە و هی دی بڵاوکراوەتەوە. مێژوونووس و ڕۆژنامەنووسی نێودار حوسێن حوزنی یەکەمین چاپخانەی کوردی، کە تێپەربوونی (٦٠) شەست ساڵەی دامەزرانی لەساڵی ١٩٧٥دا زۆر بەفراوانی یادکراوە، بەهۆی بەرهەمەکانێوە دەورێکی باڵای هەبووە بۆ پێش خستنی رۆشنبیری نەتەوەیی و نیشتمانی.

هەموو بەرهەمێکی کوردی بەشێوەیەکی سەرەکی لەعیراق دا لە کاتی ئێستەدا بە بەشە دیالێکتی سلێمانی بڵاودەکرێتەوە. لەنێو هێندێك لە خوێندنگەکان هەروا لە چەند ئینستیتووتێکدا بەم شێوەیە دەخوێندرێت .

لیکۆڵینەوە لەدیالێکتی کرمانجی خواروو لە نێوەراستی سەدەی نۆزدەم دا دەستی پێکردووە. لەو کاتەدا، کە ئێران ناسی رووس ـ آ. خۆدزکۆ لێکۆڵینەوەیەکی فیلۆلۆژی دەربارەی دیالێکتی سلێمانی چاپکرد (بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ـ ٣٨).

بەنیو سەدە دوای ئەم بەرهەمەی پێشوو بابەتێکی دی دەربارەی ئەم دیالێکتە بڵاوکراوەتەوە، کە لەلایەن رۆژهەڵاتناسی بەناوبانگی فەرەنسەیی ج. مۆرگان کەرەستەیەکی زۆری لەساڵانی (١٨٨٩ ـ ١٨٩١)دا لیٚ کۆکراوەتەوە. ئەم بەرهەمە بابەتی فۆنۆتیکی و مۆرفۆلۆژی و وشەی فەرهەنگی دیالێکتی خوارووی: موکری، سلێمانی، هەورامانی، سنەیی، جافی، گاڕووسی، لەکی، یەزیدی و .. (بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ٥٠).

ئێرانی ناسی ئەڵمانی ئوسکارمان (بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ـ ٨٤) بەرهەمێکی دوو بەرگی دەربارەی دیالێکتی موکری بڵاوکردەوە، کەمێك لەدووای ئەم بڵاوکراوەیەدا ڕێزمانی ڕاهێنانی ل. فۆسووم چاپکرا (بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ٤٢).

یەکەمین بەرهەمی ڕێزمانی بەراوردکاری نێوان دیالێکتی ژووروو و دیالێکتی خواروو لەلایەن (ئی. سون)ەوە (بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ٥٢)بەنێوی ڕێزمانی کوردییەوە بڵاوکرایەوە، لەم کارەدا دیالێکتی سلێمانی لەپاڵ دیالێکتەکانی خوارووی وەك هەکاری و موکری باسکراوە.

لەساڵی ١٩٥٨دا لە نیویۆرك ڕێزمانێکی ڕاهێنانی کوردی (دیالێکتی سلێمانی) لەلایەن ئی. مەکاروسەوە (بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ٤٧) چاپکرا.

س. ئیدمۆنس وتارێکی دەربارەی کێشەی چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەلفوبێی لاتینی بۆ نووسینی کوردی بڵاوکردەوە (بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ٤٠)، هەروا وتارێکی دی سەبارەت بە ئەرکی جێناوە لکاوەکان و پێشگر و پاشگرەکان لە دیالێکتی خوارووا بڵاوکردۆتەوە (بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ٤١).

لەساڵی ١٩٦١ ـ ١٩٦٢دا د. ن. مەکەنزی (بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ٤٤) بەرهەمێکی دوو بەرگیی چاپکرد، بەرگی یەکەمیان لەڕێزمانی هەردوو دیالێکتی سەرەکیی زمانی کوردی نێوەڕاست (ئێمە زاراوەی خوارووی بۆ بەکاردێنین) و ژووروو دەکۆڵێتەوە. بەرگی دووەمیان بریتییە لەو تێکستانەی ، کە نووسەر لە ساڵانی (١٩٥٤ ـ ١٩٥٥) دا لە کوردستانی عیراق دا بەهەردوودیالێکت کۆی کردوونەتەوە و بوونەتە کەرەستەی بەرهەمە ڕێزمانێکەی. لەم کارەدا د. ن. مەکەنزی لەپاڵ دیالێکتی سۆرانی و موکریدا باسی دیالێکتی سلێمانیشی کردووە.

لەساڵی ١٩٦٦دا لە ئۆکسفور فەرهەنگێکی کوردی ـ ئینگلیزی لەلایەن (توفیق وەهبی و س. ئیدمۆنس)ەوە چاپکرا، کە وشە فەرهەنگێکانی بریتین لە وشەکانی ئەم سەردەمەی ناوچەی سلێمانی (بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ٨٥).

یەکێك لەو بەرهەمانەی دوایی سەبارەت بەم دیالێکتە چاپکرابێت، بەرهەمێکی ج. بڵاوە (بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ٣٧) کە لە ساڵی ١٩٨٠دا لەپاریسدا بڵاویکردۆتەوە.

لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی لە عیراقدا پێرەوی تایبەتی خۆی هەیە. یەکەمین نووسەران بەرهەمی ڕێزمانی و بەرهەمی قوتابخانەیی، کە بەشێوەی سلێمانی داندرابێت،

لەلایەن ئەم زانایانەوە بووە: (سەعید صدقی (بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ٦١)، توفیق وەهبی (بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ٥٥)، نوری علی امین، محمد خاڵ (بڕوانە سەرچاوەی ٦٦، ٩٣) و هی دی. ئەم زانایانەش بەیەکەم دانەری فەرهەنگ دانان دادەندرێن، کە وشەی فەرهەنگبان دیالێکتی خواروووشی گرتۆتەوە، لەوانە محمد خاڵ، دانەری فەرهەنگی سێ بەرگییە (بڕوانە سەرچاوەی ٧٥)، یەکەم دانەری فەرهەنگی کوردی - عەرەبی، کە وشەکانی برێتین لە وشەی دیالێکتی سۆرانی و بادینانی زانای بەناوبانگ گیوی موکریانییە (بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ٧٣). فەرهەنگی زاراوەیی دوو بەرگی مارف قەرەداغی مەردوخ شوێنی دیاری خۆی هەیە لەبواری وشەی کشت و کاڵیدا (بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ٧٤)، دەستەی کوردی کۆری زانیاری عیراق بەرگی یەکەم و دووەمی فەرهەنگە کوردی - کوردێکەی عەبدولرەحمان محەمەد ئەمین زەبیحیی چاپکرد (بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ٧١).

لەم چەند ساڵانەی دواییدا لەعیراقدا چەند زمانەوانێکی کورد هەڵکەوتن، کە زۆربەیان زانستی زمانیان لەیەکێتی سۆڤێت (لینینگراد، باکۆ و مۆسکۆ)دا وەرگرتووە و بەرگریان لە نامەی دکتۆریان کردووە، کە چەند لایەنێکی زمانی کوردی گرتۆتەوە (١، ٣، ٤، ١٢).

لەو کارە نوێیانەی دەربارەی رێزمانی بەراوردکارین لەنێوان دیالێکتەکانی زمانی کوردیدا بەرهەمی ئەورەحمانی مارفە، کە دەربارەی مۆرفۆلۆژی سۆرانی و کرمانجییە (بڕوانە سەرچاوەی ژماری ٦٨)، بەرهەمەکەی محەمەد ئەمین هەورامانی کە بابەتەکە بەراوردکردنی فۆنۆتیکی و مۆرفۆلۆژی لەنێوان سۆرانی و هەورامانی دایە لەڕووی ناوەرۆکەوەی بەنرخە (بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ٦٣).

لێکۆڵینەوە لە شێوەی خواروو لەلایەن کوردناسانی نیشتمانەوە لەسەرەتای ساڵانی شەستدا دەستی پێکرد و چەند کوردێکی ناسراو لە کۆماری عیراقەوە بەرەو یەکێتی سۆڤێت نێردران و نامەی دکتۆریان سەبارەت بە زمان و وێژەی کوردی عیراقەوە تەرخانکرد و بەرگریان لێکرد و بروانامەی دکتۆریان وەرگرت (بڕوانە سەرچاوەی ١، ٢٨،

١٦، ٢١، ٢٢، ٣٠) لەساڵی ١٩٦٨دا لێکۆڵینەوەیەکی زانستی دەربارەی دیالێکتی موکری لەلایەن مامۆستایان ك. ر. ئەیوبی و ی. آ. سمیرنوڤاوە چاپ کرا. (بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ٢٩)، لە ساڵی ١٩٧٨دا بەرهەمە بەنرخ و دەوڵەمەندەکەی ك. ك کوردوێیڤ، کە دەربارەی ڕێزمانی بەراوردکارییە لەنێوان دیالێکتی کرمانجی و سۆرانی دایە بڵاوکرایەوە[٧] (بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ٧).

هەروا کێشەی مۆرفۆلۆژی و سینتاکسی لەنێو چەند وتارێکی نووسەری ئەم چەند دێرانەدا لێی کۆڵدراوەتەوە. توێژەرانی زانستی بەشی کوردناسی فەرهەنگێکی (کوردی - ڕووسی)یان ئامادە و چاپکرد، کە کوردێکەی بۆ یەکەمین جار دیالێکتی سۆرانی بگرێتەوە و لەنێو وشە فەرهەنگیکاندا وشەی شێوەی سلێمانیش بەکارهێنراوە (بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ٩).

ئەم نوسراوەی بەردەستتان لەسەر بنەمای کەرەستەیەکی دەوڵەمەند لێی کۆڵدراوەتەوە، کە لە بڵاوکراوە هونەری و زانستی و وێژەیی ئەم سەردەمە و تێکستی فۆلکلۆری عێراقن.

نووسەر سوپاسی ئەو کۆمەڵە هاوکارانەی دەرەوە دەکات، کە خۆیان بەدیالێکتی سلێمانی دەدوێن، لەوانە : ئەورەحمانی مارف - زمانەوان ، کەیکاوس قەفتان - زانا و چیرۆك نووس ، ئەنوەر قادر محەمەد - زانا و شاعیر بۆ یارمەتیدانیان لەپێداچوونەوەی کەرەستەکاندا.

نووسەر سوپاسی کارگێران و لێکۆڵەوەرانی بەشی ڕۆژهەڵاتناسی سەر بەئەکادیمیای زانستی یەکێتی سۆڤێت و بەشی لینینگراد ئینستیتوتی ڕۆژهەڵاتناسی ئەکادیمیە دەکات بۆ ئەو سەرنج و تێبینییە بەنرخانەی لەکاتی لێدوانی. دەسنووسی ئەم بابەتەدا پێشکێش کرا. هەروەها سوپاسی تایبەتی ئو. س. گریگۆریڤا دەکات بەرامبەر بە یارمەتیدانی ئامادەکردنی تیکنیکی لەپێناو چاپکردنی دەسنووسەکەدا.

## ئەلـفـــو بێ و ڕێنووس

لەشێوەی سلێمانیدا ئەلفوبێی عەرەبی - فارسی بەکاردێت لەگەڵ هێندێك گۆڕین و خستنەسەردا، تا لە دەنگی کوردی نێزیکی بخاتەوە.

ئەم جیاوازییانەی خوارەوە لەنێو ئەلفوبێی عـەرەبی - فارسـی و شـێوە کوردێکـەیدا هەیە:

١- ئەم دەنگە عەرەبییانە ( ث، ذ، ص، ض ، ط، ظ[١٠] ) ی تێدا نییە.

٢ - دانانی شێوەی تازەی (ڤ) بۆ دەربڕینی دەنگی ڤێی لێوی - دانی: مرۆڤ، گۆڤار.

٣- دانانی سەر و بۆری تازە:

آ) سەری ٧ لەگەڵ نـەبزوێندا بـەکاردێت ، کـە بـە زۆری لەسـەر (و، ی) دادەندرێـت: خۆش، بۆ، دێ، شێر. هەروا لەسەر (ل)یش دادەندرێت: گوڵ، گەڵا.

ب) ژێری لەگەڵ (ر)ی سووك بەکاردێت بۆ دەربڕینی ڕێی گران (ڕ ): ڕۆژ، کوڕ، قوڕگ.

٤- بزوێنی ( ا، ە، ی، ێ، و، ۆ) کە دەکەونە سەرەتای وشـەوە شـێوەی هـەمزەیان بە پێش دەکەوێت: ئاو، ئەو، ئیمڕۆ، ئێرە، ئورفە، ئۆخ.

٥- بزوێنی درێژی ( ) شێوەکەی بـە دووبارەکردنـەوەی نووسـینی تیپـی (و)ە: وو: دوور، هەموو.

٦- بۆ گەیاندنی واتای بزوێنی کورتی (*i*) ، کە شێوەکەی لەنێو ئـەلفوبێی عـەرەبیدا نییە، هەر تەنیا، کە دەکەوێتە سەرەتای وشەوە تێبینی دەکرێت بە هەفرە دەنووسرێت وەك *inca* ئینجا، ـ *im* ئم.

٧- بـۆ دەربڕینـی واتـای بزوێنـی کورتـی (ە) لەسـەرەتای ووشـەدا شـێوەی (ئـە)ی دەبێت، لە نێوەراستدا شێوەی (ـ ـە): ئەمە، کردە، سەرما.

٨ـ بۆ دەربڕینی (هــێ و حــێ) شـێوەی ( ه و ح )یان بـۆ دانـدراوە: هـەنگاو، هـاتن، بەرهەم، حەوت، حەپین.

٩ـ بۆ دەنگی گرانی نەبزوێن بە دووبارەکردنـەوەی شـێوەکەی دەردەبرێـت: گوللـە، کوللێرە.

شێوەی ئەلفوبێی کوردی لەسەر ئەلف و بێی عەرەبی ـ فارسی دامەزراو ، جیـاوازی دیشی لەڕووی بزوێنی کورت و بزوێنی درێژدا هەیە و بە تایبەتی بزوێنـی (*I* )، کـە هـەر تەنیا ئەگەر کەوتبووە سەرەتای وشەوە ئەوە شـێوەی نووسـینی بـەم ئەلفوبێیـە هەیـە (بڕوانە پێشتر) هەروا کێشەی نووسینی ( *u* و *w*)یش لەم ئەلفوبێیەدا بەرچاودەکەوێت ، کە بۆ هەردووییان یەك شـێوە : (و) داندراوە ، هەروا سەبـارەت بـە ( و *y*) یـش لـە یـەك شێوەدا : (ی) خۆی دەنوێنێت .

لەزمانی کوردیدا هەمیشە هەوڵی گۆڕینی ئەلفوبێیەکەی بـە مەبەسـتی پڕکردنـەوەی دەنگەکان دراوە ، کە ئەمانەی ژێروون:

١ـ بۆ بزوێنی (ا) درێژ شێوەی آ، ا، ئا هەیە.

٢ـ یەك جۆرە شێوە هەیە. بۆ بزوێنی و هەروا بۆ نیمچە بزوێنی ( *y*).

٣ـ بزوێنـی درێـژی (ۆ، وو) و بزوێنـی کورتـی (و) و نیمچـە بزوێنـی (و) هـەموو هـەر لەیەك شێوەدا: (و) کۆ دەبنەوە.

٤ـ هەردوو دەنگی لێ یەك جۆرە شێوەی دراوەتی ل.

٥ـ هەردوو دەنگی (ر)ێ یەك جۆرە شێوەیان هەیە (ر). کە لەم دواییەدا ڕێـی گـران شێوەی (ڕ) بۆ داندراوە و لەمەوبەر بەدووبارەکردنەوەی تیپەکە: (رر) دەردەبڕا.

کۆڕی زانیاری کورد لە ساڵی ١٩٧٣دا خەریکی پێڕەوی ڕێنووسـی کـوردی بـوو، کـە جۆری کێشەکانی ئەلفوبێشی دەگرتەوە، لەوانە باسی کێشەی بزوێنی درێـژی (ی و وو)، کە شێوەی (ێ و ۆ)یـان بـۆ دانـا و هـەروا بـۆ نـەبزوێنی ڕێـی گـران شـێوەی (ڕ)یـان بـۆ نەخشاند (بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ٥٧)، بـەڵام ئـەم شـێوە تازانـە نەچەسـپێن و لـەنێو بەرهەمـە بڵاوکراوەکـان دا لـەپاڵ ئـەم شـێوە تازانـەش شـێوە کۆنـەکانیش بەرچاودەکەون[٨].

تایبەتێتی نووسینی عەرەبی نەیتوانیوە لـەنێو ڕێنووسـی کوردیـدا ڕەنـگ بداتـەوە، لەنێو چاپەمەنی کوردێکاندا وشە عەرەبێکان بەچەند جۆرە نووسینێك بەرچاودەکەون و هێندێك لـە وشـەکان بەلێکـدراوی دەنووسـرێن وەیـا هـەر هـەمان ووشـە بـەجیاجیا دەنووسرێن.

## نەخشەی ژمارە ـ ١ ـ

## ئەلف و بێ و دەربرینی بەهۆی نیشانەکانی دەنگ

| ا ** [ ئا ] | a | ژ | j | م | m |
|---|---|---|---|---|---|
| ب | b | س | s | ن | n |
| پ | p | ش | ş | و [ ئو ] | U, w |
| ت | t | ع | ـ | ۆ [ ئۆ ] | o |
| ج | c | غ | x̄ | وو | û |
| چ | ç | ف | f | ە [ ئە ] | e |
| ح | ħ | ڤ | v | هـ | h |
| خ | x | ق | q | ی [ ئی ] | î, y |
| د*** | d | ك | k | ێ [ ئێ ] | ê |
| ر | r | گ | g | **** [ ئی] | i |
| ڕ | r | ل | l | | |
| ز | z | ڵ | خ | | |

لەم چەند ساڵانەی دواییدا لە عیراق دا چەند کـارێك سـەبارەت بەرێنووسـی کـوردی بڵاوکرایەوە (بڕوانـە سـەرچاوەی ژمـارە (٥٤، ٥٧، ٦٦)، کـە چـەند بناخەیـەکی یاسـای چۆنیـەتی ڕێنووسـی دەگرتـەوە، ئـەم یاسایانە چـەند بڕیـارێکی تێدابـوو، کـە یارمـەتی ڕێنووسی کوردی دەدات و بەگشتی ئەم خاڵانەی دەگرتەوە:

١ـ وشەی عەرەبی وەك سەلام لەرێنوسی کوردیدا بە سەلام بنوسرێت نەك صەلام.

٢ـ لە برێتی شەدە وەکو جاران بەکاردەهات لەوشەیەکی وەکو (زلّە) دا وەیا (مەکّە) دا بە دووبارەکردنەوەیە تیپەکە چارەسەرکرا: زللە. مەککە.

٣ـ کە بزوێن دەکەوێتە سەرەتای ڕستەوە ( ء )ی بەپێشدەکەوێت: ئاش، ئێوارە.

**٤ـ لەنێو نەبردنی بزوێنی کورتی و ، کە لەدوای نیمچە بزوێنی (w) دێت: ووشە، ووتار.**

٥ـ لەنێو نەبردنی نیمچە بزوێنی (y) لەو وشانەی وەك (گەیشتن) و (زایین) دان.

٦ـ وشەی دارێژراو بەهۆی پاشگرەوە هەروا پاشبەندی ئامرازیش لەکاتی نووسیندا بەوشەوە دەلکێت و دەبێت تێبینی ئەوەش بکرێت، کەوا لە نێوان دوو نیمچە بزوێنی (و، ی) دەکەونە نێوان دوو بزوێنەوە.

**یاسای چۆنیەتی نووسینی وشەی لێکدراو لەم بارانەی خوارەوەدا روونکراوەتەوە:**

١ـ ئەو وشە لێکدراوانەی بە یارمەتی ناوگری ـ ە ـ وەیا بەبێ ئەو دارێژراون نێزیك لێك دەنووسرێن لەو بارەدا ناوگرەکە بە کۆتایی وشەی یەکەمەوە دەلکێت: دڵخۆش، گوڵەبەهار، کاروبار.

٢ـ ئەو وشە لێکدراوانەی وشەی یەکەمیان لە گروپی ناویین لەکاتی نووسیندا دوور لێك دەنووسرێن: تەواو کردن، رزگار بوون. ئەگەر هەردوو وشەکە تێکرا واتای ناوی ببەخشن، ئەوا لێك نێزیك دەنووسرێن: تەواوکردن، رزگاربوون.

لەکاتی نووسینی وشەی دارێژراودا پێشگرەکە بە وشەکەوە دەلکێت: لێدان، پێکهێنان، تێکچوون. بەڵام لەو بارەی جێ ناوی کەسی لکاو و بکەوێتە نێوانیانەوە، ئەوە پێشگر و کارەکە لێك دەبنەوە[١٤].

# فۆنۆتیك

## بزوێن

دەنگی نەرم لە شێوەی سلێمانیدا برێتیە لە:

بزوێنی درێژ: ی، ێ، ا، ۆ، وو[١٥]؛

بزوێنی کورت: بزرۆکە، ە، و؛

دیفتونگ: وا، وێ، وی.

**نەخشەی ژمارە ٢**

**بزوێن**

| پلەی بەرزی | ریزی | | |
|---|---|---|---|
| | پێشەوە | تێکەڵاو | پاشەوە |
| سەروو | ی | | وو |
| نێوەراست | ێ | بزرۆکە | و |
| خواروو | | ە | ا |

شێوەی هەر بزوێنێك لەم بزوێنانە لەرووی شوێنی لە وشەدا و بوونی هێز لە وشەکەدا دەگۆرێت، هەروا لەلایەن تایبەتێتی چەندی و چۆنیش دا هەست بە جیاوازی ئەم بزوێنانە دەکرێت.

## بزوێنی درێژ

ی - بە بزوێنی ریزی پێشەوە بەرز دەژمێردرێت. کە دەکەوێتە سەرەتای وشە بەزۆری لەنێو وشەی عەرەبیدا بەدی دەکرێت. کە ئەم بزوێنە هێزی لەسەر نابێت زۆر کورت دەکرێتەوە وەکو دەنگی نیمچە بزوێنی (ی - y) لیٚ دێت:

ئیش، پـیری، زیـن. ژیـا، بـەیانی‌یان و بـەیانی ڕۆیشـت roîşt و ڕۆیشـتن royştin بەراورد بکە هەروا لەگەڵ ئەگەر برۆشتایە (biroştaye)ی دیسانەوە بەراورد بکە کە (ی) بەیەکجاری لەنێوچووە و نەماوە.

ێ - بزوێنی ریزی پێشەوە لەهەموو بارێکدا بەرچاودەکەوێت:

ئێستا، شێو، دێ، پێکەنین، داهێنان.

۱- بزوێنی ڕێزی پشتەوە لەهەموو بارێکدا بەرچاودەکەوێت:

ئافرەت، باران، سووتا، کات.

ۆ - بزوێنـی ڕیـزی پشـتـەوە، لـە سـەرەتای وشـەدا کـەم بـەکاردێت (بەشـێوەیەکی سەرەکی بۆ سەرسوڕمان لەسەرەتادا بەرچاودەکەوێت): بۆ، بڕۆ، کۆن، گۆرەوی، ئۆف، ئۆخ !

وو - بزوێنـی ڕیـزی پشـتـەوە، لەسـەرەتای وشـەدا نـابێت و هێندێك جـار هـێزی لەگـەڵ بەکارنایەت: دوور، موو، چووکە، مووروو، بەم زوانە، ئەم دوو وشـانە بـەراورد بکـە: زوو- ئەفەرموێ هـەروا ئـەم وشـانەش لـەنێوان خۆیـان دا بـەراوردیان بکـە: فـەرموو، کوڕێکم بوایە، کوڕێکی بوو.

## بزوێنی کورت

بزرۆکـە (*i*) بزوێنـی ڕێـزی تێکـەڵاو و بەشـێوەیەکی گشـتی و ئاشـکرا هـێزی لەگـەڵ بەکاردێت، لەو بارەدا کەهێزی لەگـەڵ بەکارنایـەت زۆر کـورت دەبێت و ئـەم بزوێنـە لـە کۆتایی وشەدا بەرچاو ناکەوێت: ژن (jin)، لەگەڵ ژنەکەم (jnekem)دا بـەراوردی بکـە، شت (şit) لەگەڵ شتێکی جوانە (şêkî cwane) دای بـەراورد بکـە، بـرا (bira) لەگـەڵ براکەی (brakey) دا بەراورد بکـە، بـزن (bizin) لەگـەڵ بزنـی سـپی ( bizni sipî) دا بـەراوردی بکـە و هتـد. بزرۆکـە لەسـەرەتای وشـەدا هـەر تـەنیا لـەم وشـانەدا بـەرچاو دەکەوێت ئنجا (inca)، ئم (im) بـەڵام ، کـە دەکەوێتـە دوای نیمچـە بزوێنـی (w) ئـەوا بزوێنی کورتی (و) شـوێنی بزرۆکەکـە دەگرێتـەوە: بـاووك (bawuk) لەگـەڵ بـاوکی من

bawkî min خەووت xewut (یانی خەوی تۆ ـ وەرگێر)، ووشك (wuşik).

٥- بزوێنی ڕێزی نێوەراست، بەپێی جۆری فۆنەتیکی لەسەرەتا و کۆتایی وشەدا دەبێت و لە ڕووی شوێنەوە باری ئاوەڵە وەیا نا ئاوەڵەیی پێك دێنێت: بەر، ئەمە، ئەستوور، دەست، کەنار و هی دی.

و - بزوێنی ڕیزی پشتەوەیە، بەشێوەیەکی سەرەکی لەنێوەراستی وشەدا دەبێت و زۆر کەم لەسەرەتادا بەدی دەکرێت، بەڵام لە کۆتایی وشەدا نابێت:

کورد، گورگ، کوشتن، ئورفە، سولەیمانی // سلێمانی، وورد // ورد، ووریا // وریا، ووت // وت.

بزوێنی قورگی لە هێندێك وشەی عەرەبیدا لەگەڵ نەبزوێنی ع دا بەکاردێت، وەك عەیب ـ ئەیب، عار ـ ئار، عیلم ـ ئیلم ، شاعیر ـ شایر، سەعات، سات و هی دی. هێندێك باری وا ڕوودەدات نەبزوێنی (ع)ی بەکارنایەت و ئەم وشانە بەراوردبکە: عەشیرەت ـ ئەشیرەت، مەعنا ـ مەنا // مانا، قورعان ـ قوران، شاعیر ـ شایر، عەنتیکە ـ ئەنتیکە، عەلی ـ ئەلی، عبدالرحمن // ئەڤرەحمان[١٦] .

## دیفتونگ

- وا: چوار (çwar) çuar، کوا (kwa) kua ، جوان (cwan) cuan خواردن (xwardin) xuardin ، ڕوانین (rwanîn) ruanîn، بزواندن (bizwandin) bizuandin. وهی دی.

- وێ uê : گوێ (gwê) (guê)، خوێ (xwê) xuê، کوێر (kwêr) kuêr، بلوێر (bilwêr) biluêr، شوێن (şwên) şuên وهی دی.

- وی uî: هەنگوین (hengwin) henguîn ، پێنجوین (pêncwîn) pêncuîn.

## نەبزوێن

بەپێی تایبەتێتی کونسونانتی شێوەی سلێمانی (بڕوانە خشتەی ژمارە ٣) دەتواندرێت ئەم نەبزوێنانە دەستنیشان بکرێن:

فۆنیمی کپی پ، ت، ك بۆی هەیە دەنگی نەرمی گەروویی هەبێت، کە هیچ واتایەکی فۆنۆلۆژی ناگەیەنێت[١٧]. ئەمانە بەراورد بکە: پان و سەپان، پێڕێ و پێ، پەنیر و پەنا، تا و تالان، تاریك و تارمایی، شێتۆکە و تۆڵە، کانی و کانێ، کۆن و کۆ، کورت و کورد، ژوورەکە و کەی و .. کە فۆنێمی (ك) دەکەوێتە پێش (ی، ێ، وێ) دەنگی دەگۆڕێت و گۆکردنی وەکو دەنگی (چ) لێ دێت: کێ، کێو، کیمیا، کیسەڵ، کوێخا، کوێ و هی دی.

هەروا فۆنیمی (گ)، کە دەکەوێتە پێش ئەو بزوێنانەی، کە لەگەڵ فۆنیمی (ك)دا دێن و دەنگی دەگۆڕن لەگەڵ (گ)یش دا دەبنە هۆی دەنگ گۆڕینی و هەروا دیفتۆنگی (وێ و وی) یش هەمان دەور دەگێڕن: گوێ، گێڕانەوە، گێتی، هەنگوین و هی دی.

فۆنێمی (ڤ) لەنێو ژمارەیەك وشەدا تێبینی دەکرێت، کە بە شێوەیەکی سەرەکی لاسایی کردنەوەی دەنگ دەردەبڕێت:

گڤەگڤ، ڤنگە ڤنگ، ڤیزە ڤیز، ڤرە ڤڕ.

هەروا لەنێو ئەم وشانەش دا هەیە:

هەڤ (د)ە، مرۆڤ، گیڤ، خۆگیڤ کردن و هی دی.

فۆنیمی (غ) کەم بەکاردێت و لەنێو ئەو وشانەش دا هەیە بەزۆری، کە کوردی نین (بە تایبەتی لەنێو وشەی عەرەبی دا هەیە): غەریب، غەڵەت، غاز، ئاغا، داغ، قەڵەبالغ، دەغەڵ، دەغڵ، یەغدان، کە دەکەوێتە کۆتایی وشەوە دەنگی (غ) بۆی هەیە ببێتە دەنگی (خ) وەك لەوشەی باغ // باخ، تیغ // تیخ، ساغ // ساخ، دەماغ // دەماخ، سیغ // سیخ دا تێبینی دەکرێت.

# خشتەی ژمارە ۳

## نەبزوێن

| بەپێی شوێنی سازگەی / بەپێی هۆی دەربڕینی | | | لێوی | لێوی دانی | پێشەوەی زمان | ناوەڕاستی زمان | باشەوەی زمان | قورگی | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | | | | گەروویی | خوارووی قورگ |
| بۆ دەنگی تەکەرەیی | داخراو | سادە | ب پ | | د ت | | گ ک | ق | |
| | | نیمچە داخراوی لێکدراو | | | | ج چ | | | |
| | بۆ دەنگی لێکدراو | دەنگی یەک سازگەیی | | ف | ز س | | غ خ | ح | ھ |
| | | دەنگی دوو سازگەیی | | (ڤ) | ژ ش | | | | |
| بۆ دەنگی بەرز | داخراو | | م | | ن | | | | |
| | بۆ دەنگ لێکدراو | دەنگی نەرمی بڵاوە | و | | ل | ی | (ن) | | |
| | | گران | | | ڵ | | | | |
| | لەریەو | دەنگی نەرمی بڵاوە | | | ر | | | | |
| | | گران | | | ڕ | | | | |

فۆنیمی (ح)یش لەنێو وشەی نـاکوردیدا بەرچاودەکـەوێت و بـەکاردێت و بەتایبـەتی لەو وشانەدا کە فۆنیمەکە دەکەوێتە سەرەتای وشەوە:

حەد، حەکیم، حەج، حەق، حاڵ، حیلە، حورمەت، زەحمەت، زەبەلاح و هی دی.

کە فۆنێمی (ن) دەکەوێتە پێش فۆنێمی (گ) گۆکردنەکەی دەکەوێتە کۆتایی زمانەوە و گرانتر دەبێت و (گ) گۆناکرێت لەم وشانەدا تێبینی دەکرێت:
ڕەنَ (ڕەنگ)، مانَا (مانگا)، مەنَ (مەنگ) و هی دی. هەروا هەمان دەنگ بەبێ بوونی هیچ هۆیەکی فۆنۆتیکی لەنێو هێندێك وشەدا هەن: سیانزە (سیانگزە)، پانزە (پانگزە) و هی دی[١٨].
فۆنێمی (ڵ) و (ڕ) یٚ لەسەرەتای وشەدا نایەن.

## پرۆسێسی فۆنۆتیکی

١- پەیدابوونی هێندێك دەنگ لە بەیەك گەیاندنی بزوێناندا:
آ) دەنگی (y): دەرگایەکە > دەرگا + ـ ەکە، هێشوویێك > هێشوو + ێك و هی دی.
ب) دەنگی (w)، کە زەحمەت دەبیسترێ.
خانووەکە (Xanuwaka) > خانوو + ەکە،
دووەم (dûwem) > دوو + ەم. لەگەڵ (دوو + هەم) دا بەراوردی بکە.
کەوتووە (kewtûwe) > کەوتوو + ە و هی دی.
پ) دەنگی (ت) لەگەڵ کاردا:
هێنایەتەوە (hênayetewe) > هێنایە + ەوە،
چووەتەوە (çûwetewe) > چووە + ە و هی دی.
ت) دەنگی (ڕ) (لەگەڵ شێوەکانی دارکا):
بلێرەوە > بڵێ + ـ ەوە.
بکەرەوە > بکە + ـ ەوە. و هی دی.
ج) دەنگی (ه) (لە داڕشتنی ژمارەی پلەییدا دووهەم > دوو + ـ ەم (لەگەڵ دووەم دا بەراوردی بکە).
سێهەم > سێ + ـ ەم (لەگەڵ سێیەمدا بەراوردی بکە).

٢- لێکچوونی بزوێنی تێکەڵاو.

آ) پەرەسەندوو:

چەقۆکە > چەقۆ + - ەکە (ناسراوە).

هەرمێکە > هەرمێ + - ەکە (ناسراوە).

ب) پەرەنەسەندوو:

لێرە > لە + ئێرە

چاوەکان > چاوەکە + - ان و هی دی.

٣- بزوێن هێندێك بزوێنی نوێی دی دێتە سەر و بە جۆری دی دەگۆرێت:

برسێتی > برسییەتی

بۆوە > بوو + - ەوە.

هاتۆتە > هاتوو + - ەوە + ە.

٤- ئاوازەی دەنگی - ی **î**

برای > برا + - ی **î** = برای لەگەڵ باوك + - ی **î** دا بەراوردی بکە.

برانیە > برا + - ینە و هی دی.

٥- دارشتنی دیفتۆنگ:

وێ **uê** (ئەنوێ (**enué**)// **enwê** > ئەنوو + - ێ )

وا **ua:**

ئەروا **eŕua** // **aŕwa** > ئەرۆ **eŕo** + آ وهی دی.

٦- لەنێوچوونی هێندێك نەبزوێن:

آ) دەنگی (ھ)ێ:

رۆژ (هـ)ەلات، بێنە < بهێنە، (هـ)اوان.وا > وەها، (هـ)ەوەڵ، (هـ)ێستر و هی دی.

ب) دەنگی (ت)ی (لەگەڵ - ست - دا) هەڵس (ت) ان، بەس (ت)ە زمان دەس (ت) و هی دی.

پ) دەنگی (د) ێ:

من (د)اڵ، تەنـ (د)وور، چەنـ (د) و هی دی.

## وشەکانی زمان

## (تایبەتێتی گشتی)

بناخـەی وشـەکانی شـێوەی سـلێمانی هــەر سـامانی وشــەکانی زمـانی کـوردی دەگرێتەوە بەگشتی، کە بەشی گرنگی هاوواتای وشــەی وێـژەی کلاسیکی سلێمانییە .

وشەکانیش دابەش دەکرێنە سەر ئەم بەشانەی خوارەوە:

١ـ وشەی کوردی بەگشتی، کە لەنێو جۆرەکانی دی شێوە کوردێکان دا هەن و لەوانەیـە لەگـەڵ وشـەکەدا لەهـەمان شـێوەی سـلێمانی وشـێوەکانی دیدا بەتـەواوی لێـك بچـن و لەوانەشە وشەکە لەڕووی واتا و فۆنۆلۆژێوە لێك دووربن: ئـەم بـارەی هـەرە دوایـی ئـەم لایەنانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

**١) دیاردەی سروشتی، کاتەکانی ساڵ و هی دی:**

هاوین، کرمانجی ـ هاڤین، گۆرانی ـ هامن)، با (کرمانجی ـ با، گۆرانـی ـ وا)، ئـاگر (کرمانجی ـ ئاگر، گۆرانی ـ ئاور، ئایر، ئاهیر)، ئـاو (ئـاڤ، گۆرانـی ـ ئـاو)، رۆژ (هـەتاو) (کرمانجی رۆ // رۆژ، گۆرانی رۆ // رۆژیار)، رۆ // رۆژ (کرمانجی رۆژ، گۆرانی رۆ)، شــەو (کرمانجی شەڤ، گۆرانی شەو // شەوە)، هەور (لەکرمانجی و گۆرانیش هەر هەورە)، مژ (لەکرمانجیشدا هەر مژە)، کەژ (گۆرانی کەژ//کەش) و هتد..

**٢) پێوەندی خزمایەتی:**

دا // دایك (کرمانجی دا، دایك // دێ، گۆرانی ـ دا // داکۆ)، باب // باو // بـاوك (کرمانجی ـ باڤ // باڤك، گۆرانی ـ بابـ (ۆ) // باو)، کوڕ (لەکرمانجی و گۆرانیدا هـەمان

وشه بەکاردێت) کچ (کرمانجی ـ کچ // کەچ (ك)، گۆرانی ـ کناچە)، خوشك (کرمانجی ـ خوشك // خویشك // خشك، گۆرانی ـ خۆیشك)، برا (لە کرمانجی و گۆرانیشدا هەمان وشە بەکاردێت)، ژن (کرمانجی ـ ژن، گۆرانی ـ ژەنی)، ژن برا (کرمانجی ـ مێر، گۆرانی ـ ژەن برا)، مێرد (کرمانجی ـ مێر، گۆرانی ـ مێرد)، زارۆ // زارۆك // زارۆلە (کرمانجی ـ زارِ // زارۆك، گۆرانی زارۆ (لە))، دەسگیران ـ دەزگیران) و هتد.

٣) **ئەندامانی تەنی مرۆڤ:**

چاو (کرمانجی ـ چەڤ // چاڤ، چەهڤ // چەعف، گۆرانی چەم // چەو)، زمان (کرمانجی ـ زمان، گۆرانی ـ زووان)، دەم (کرمانجی ـ دەڤ، گۆرانی ـ دەم)، گوێ (کرمانجی ـ گوه، گۆرانی ـ گۆش)، مل (هەمان وشەیە لە کرمانجی و سۆرانی دا)، ئەستۆ (کرمانجی ـ ستو (هـ) // ستوکور، گۆرانی ستکر)، قژ (لە کرمانجیش هەر قژە، گۆرانی قژە)، کەلەکە (کرمانجی کێلەك، گۆرانی ـ کەلەکە)، برۆ (کرمانجی ـ بری // بروو، گۆرانی ـ برۆ)، دان // ددان (کرمانجی ـ دران، گۆرانی ـ ددان)، قنگ // کنگ (کرمانجی ـ قوون، گۆرانی ـ قنگە، سك // زگ (کرمانجی ـ زك)، لێو (کرمانجی ـ لێڤ، گۆرانی ـ لەو // لەب)، چۆك (لە کرمانجی و گۆرانیدا هەمان وشەیە) برژانگ (لەکرمانجی و گۆرانیش دا هەر هەمان وشەیە)، سنگ // سینە (کرمانجی ـ سنگ، گۆرانی ـ سینە)، پێ // پا (کرمانجی ـ پێ، گۆرانی ـ پا // پێ)، بەژن (لە کرمانجی و گۆرانیشدا هەمان وشەیە)، پێست (کرمانجی ـ پۆست، گۆرانی ـ پۆس // پۆست)، خوێن (کرمانجی خوون، خێن // خوین، هوون // خوون)، مێشك (مەژی // مەژوو، گرانی ـ مەژك) و هتد.

٤) **نیشانەی چۆنیەتی**، ڕەنگی شت: گەورە (لە کرمانجی و گۆرانیدا هەر گەورەیە)، مەزن // مازن (کرمانجی ـ مەزن، گۆرانی ـ مەزن)، درێژ (لە کرمانجی و گۆرانیش دا هەر درێژە)، نزیك (کرمانجی ـ نێزیك، گۆرانی ـ نزیك)، زوو (لەکرمانجی و گۆرانیش دا هەر

زووه)، ئازا (له کرمانجی و گۆرانیش دا هەر ئازایه پووند |اك| (کرمانجی - رۆن، گۆرانی - رۆشن)، کاول (لەکرمانجی و گۆرانیش هەر کاوله) سوور (کرمانجی - سۆر، گۆرانی - سوور)، ڕەش (کرمانجی - رەش، گۆرانی - سیاو)، سپی (کرمانجی - سپی، گۆرانی - سپی، چەرم |گ|، سەوز (له کرمانجی و گۆرانیش دا هەر سەوزه)، ڕەق (لەکرمانجی و گۆرانیش دا هەر ڕەقه). تیژ (لەکرمانجی - تووژ، گۆرانی - تیژ)، تووره (گۆرانی - تووره) و هتد.

**٥) بزووتنەوه، ڕووداو (بەشێوەیەکی سەرەکی کاری بەکارهاتوو لەشێوەی بناخەی کاتی رابوردوودا دەبێت):**

ئێشا (رکمانجی - ئێشا // ئیشیا، گۆرانی - ئێشا)، دا )لەکرمانجی و گۆرانیش دا هەر |دا|یه)، زانی (کرمانجی - زانی، گۆرانی - زانا)، ڕژا (کرمانجی - ڕژیا، گۆرانی - ڕژیا)، ووت (کرمانجی - گۆت، گۆرانی - وات)، گریا (کرمانجی - گریا، گۆرانی - گرەوا)، خوارد (کرمانجی - خار // خوار، گۆرانی - وەرد)، گرت (لەهەردوو دیالێکتەکەدا هەر گرته)، بوو (کرمانجی بوو، گۆرانی - بیٚ)، چوو (کرمانجی - چوو، گۆرانی - چی // شی)، دیت // دی (کرمانجی - دیت، گۆرانی - دی)، خست (کرمانجی - خست، گۆرانی - وست)، خواست (کرمانجی - خواست // خاست // خوەست، گۆرانی - واست)، گەست (له کرمانجی و گۆرانیش دا هەر هەمان وشەیه)، پست // ڕێسی (کرمانجی پست /*/ ڕێست، گۆرانی ڕەست)، گواست (کرمانجی - گوهاست، گۆرانی - کیاست)، کەوت (کرمانجی - کەت، گۆرانی - کەوت // کەفت)، نا (کرمانجی دانی، گۆرانی - نیا) وهتد.

**٦) وشەی واتای جۆراوجۆر:**

میٚ (له کرمانجی و گۆرانیش دا هەر میٚیه)، نێر (له کرمانجی و گۆرانیش دا هەر نێره)، پشیله (کرمانجی پشیك، گۆرانی - پشیله)، قوڵنگ (له کرمانجی و گۆرانیش دا

هەر قولنگە)، ماسی (کرمانجی ماسی // مەسی، گۆرانی - ماساوی // ماسای)، بزن (کرمانجی - بزن، گۆرانی - بزە)، زام (لە کرمانجی و گۆرانیش دا هەر زامە)، قرژانگ // قرژاڵ (کرمانجی - قرژانگ، گۆرانی - قرژانگی)، چەڵتووك (لە کرمانجی و گۆرانیش دا هەر ئەو وشەیە)، دیسان (کرمانجی - دیسا // دیسان، گۆرانی - دیسان) فرە (لەکرمانجی و گۆرانیش دا هەر فرەیە)، ژێر (کرمانجی - ژیر، گۆرانی - چێر، ژار (لەکرمانجی و گۆرانی دا ژەرە) وهتد.

٢- ئەو وشانەی هەر بەدیالێکتی خوارووەوە تایبەتن.

پیاو (گۆرانی - پیا// پیاگ)، پەنجە، باوەژن، (گۆرانی - باوەژەنی)، ڕۆڵە، منداڵ، جووتیار، بەسەزمان (گۆرانی - بەسەزوا(و) ان)، بەزەیی، هەژار، شێت، دراوسێ، فرمێسك، بەڵێن، بەش، لچ، گەڵا، شووتی، پەرژین، مانگ، لافاو، دووکەڵ، گلێنە، گۆرانی، دەزوو، مەڕ، پەپوولە، کەڵەشێر، مانگا، بڵێسە، مێژوو، نەتەوە، کۆمار، لا، لادێ و..

٣- ئەو وشانەی لە ڕووی فۆنەتیك و واتاوە لە زمانی فارسی نێزیکن:

سەر، دەس// دەست، پشت (فارسی پوشت)، دڵ، گوڵ، شانە (فارسی - شان)، کەف، خاك، تۆپ (فارسی - توپ)، لاشە (فارسی - لاش)، سەگ، شەرم، شیر، شار (فارسی - شهر)، شیرین، ڕاست، چەپ، لات، ساڵ، تەڕ، کار، ئازا (فارسی - ئازاد)، نان، پووچ، برنج، سارد (فارسی - سەرد)..

٤- ئەو وشە عەرەبییانەی لەهەردوو شێوەدا وەکو یەك بەکاردێن:

ئەقل، ئازیز // ئەزیز، شەرت، قسە، جاسوس، حاڵ، بەیت، وەخت، تاریخ، خەتەر، سات // سەعات، تابون و..

لێرەدا پێویستە ئەوە بگوترێت، کەوا لە شێوەی سلێمانی ئەمڕۆدا وشەی عەرەبی لەچاو بەرهەمە کلاسیکێکاندا کەمتر بەکاردێت، لەبرێتی وشە عەرەبێکان و شەی کوردی بنجی بەکاردێت: مێژوو (عەرەبی - تاریخ)، نەتەوە (عەرەبی - خەلق)، پێویست (عەرەبی -

لازم)، زیرەك (عەرەبی ـ ئاقل)، كات (عەرەبی ـ وەخت)، نیشتمان (عەرەبی ـ وەتەن) و هتد.

زۆر لەو وشە عەرەبییانەی کەوتوونەتە نێو زمانی کوردێوە، وشەی نوێی دییان لێ دارێژراوە: نەخش (عەرەبی ـ نقش)، نەخشە، نەخشین، نەخش کردن؛ هەق// حەق، هەقانی، هەق بڵێ، هەق کردنەوە/// سەندنەوە و هتد.

٥ـ وشە وەرگیراوەکانی زمانانی فارسی وتورکی لەبەراوردکردنیدا لەگەڵ ئەوەی پێشوو رێژەکەی کەمترە:

دەریا، گوزەر، فرستادە، کوشندە، ئاڵتون، چەمکە، چەتە، چەخماخ، کورنوش و هتد..

٦ـ لە شێوەی ئەمرۆی سلێمانیدا هەروا وشەی ئەوروپایی ـ بەری رۆژئاوای ـ بەکاردێت: بۆمبا، دۆمینە، چینکۆ، گاز // غاز، کەرەنتینە، کۆنگرە، لاستیك، پۆستە، میگناتیس و هتد.

٧ـ هەروا چەند وشەیەکی زمانی رووسیش بەرچاو دەکەوێت:

سەماوەر، رووس، سپوتنیك، کۆلخۆز، سۆڤیەت و هتد..

ئەمرۆ کارکردن لە زاراوەی زانستی و تیکنیکی و رامیاری و .. لە بواری زانستی فەرهەنگ داناندا لە ئەرکە بنچینەیەکانی زمانی کوردی دەژمێردرێت، جێبەجێکردنی ئەم کارە کەوتۆتە سەر لیژنەکانی کۆری زانیاری کورد، کە لە ماوەی چەند ساڵێکدا لەسەر بناخەی وشەی کوردی و عەرەبی و ئەوروپاییدا خەریکی رێك خستنی ئەم جۆرە زاراوەیانە بوون و ئەنجامەکانی کارەکەیان لەنێو بڵاوکراوەکانی کۆری زانیاری کورددا لەنێوان ساڵی ١٩٧٣ ـ ١٩٧٦دا چاپکرا، بروانە (سەرچاوەی ژمارە ٥٨ و ٥٩).

# مۆرفۆلۆژی

## ناو

ناو له شێوەی سلێمانیدا تایبەتێتی ناسیاری و نەناسیاری، ژمارە و دۆخی هەیه.

ناو له ڕستەدا دەوری نیهاد (سەرکار)، بەرکاری ڕاستەوخۆ و تیان و دیارخەر و ئاوەڵگوزار، دەگێرێت. که ناو له دەوری ناوی دیارخراودا دەبێت، ئامرازی خستنەسەری پێوه دەلکێت، شوێنیشی بەپێی نیشانەی ناسیاری و نیشانەی نەناسیاری، که بەناوی دیارخراوەوه دەنوسێت دەگۆڕێت، هەروا جێگەکەی به گوێرەی جۆری دیارخەر دیسانەوه دەگۆڕێت (بڕوانه بابەتی ـ ئامرازەکانی خستنی سەر لەنێو ئەم بەرهەمەدا).

## نیشانەی ناسیاری

لەشێوەی سلێمانیدا دوو جۆره نیشانەی ناسیاری هەیه:

( ـ ەکه) و ( ـ ه) یه.

نیشانەی ـ ەکه لەچاو مۆرفێمەکانی دی لەگەڵ ناودا زۆرتر بەکاردێت و ئەم شێوه فۆنۆلۆژییەی خوارەوەی دەبێت:

١ـ لەگەڵ ئەو ناوانەی کۆتاییان به نەبزوێن دێت هەر لەشێوەی (ـ ەکه)دا دەبێت:

**منداڵەکه چاوەڕوانی ئەوه بوو تۆپەکەی بۆ بهاوێن.**

**ئێوارەیەك کوڕەکه ئەچێ بۆ ڕاو.**

**ژنەکه ڕووی تێکردمەوه.**

٢ـ لەگەڵ ئەم ناوانەی کۆتاییان به بزوێن هاتووه بەم جۆرەی ژێروو دەبێت:

آ) لەدووای بزوێنی (ـ ی) نیشانەی ناسیاری له شێوەی (ـ یەکه)دا دەبێت و هێندێك جاریش شێوەی (ـ ێکه):

**قازییەکه لەدوای ڕۆیشتنی ژنەکه ووتی..**

**ڕێوییەکه لەتەنیشت مەنجەڵەکەوه دانیشت.**

ئەم ڕستەیەی ژوورروو لەگەڵ ئەم ڕستەیەی ژێروو بەراورد بکە:

**رێویکە توورە بوو.**

ب) لەدوای بزوێنی (ـ وو) شێوەی ((و)ەکە)ی دەبێت و بە دەگمەنیش شێوەی (ـ ۆکە):

**بێچوو (و)ەکە دڵی لەترسا کەوتە کوتەکوت.**

**منداڵەکان لەژێر سێبەری شاتوو(و)ەکەدا نووستن.**

**پیرەژنێك لەبەر خانوو(و)ەکەی دانیشتووە.**

**ئەم ڕستەیەی ژوورروو لەگەڵ ئەم ڕستەیەی ژێروو بەراورد بکە:**

**خانۆکەیان زۆر جوانە.**

ب) لەدوای بزوێنی ( ـ آ، ـ ە، ـ ێ، ـ ۆ) شێوەی ( ـ کە) دەبێت و بە دەگمەن شـێوەی ( ـ یەکە)ی ببێت:

**ساواکەی لە لانکەکە دەرهێنا و گرتیە باوەشی. پارەکەم بدەرێ.**

**بەڵام کاتێك چوومە دێیەکە بۆم دەرکەوت ، کە کۆسپ و تەگەرە هەر زمان نـەزانین نەبوو.**

**وا منیش ئەچم چەقۆکە تیژ ئەکەم.**

کە نیشانەی ناسیاری لەگەڵ ناوێکدا بەکاردێت لەباری کۆدا بێت نیشانەکە لەگـەڵ نیشانەی کۆ تێکەڵ دەبێت و بەهەردوویان لەشێوەی (ـ ەکان) دا دەبن:

**چەند قسەیەکی لەگەڵ ژنەکان کرد.**

**شێخ سەلام چوارینەکانی خەیامی هەر بە شیعر گۆری بۆ زمانی کوردی.**

نیشـانەی ناسـیاری (ـ ە) // ( ـ یـە)، (کـە لـەدوای ناوێکـەوە دێـت کۆتــایی بــە بزوێــن هاتنبێت) لەگەڵ ناوێك دا بەکاردێت، کە جێناوی نیشانەی (ئـەم) وەیـا (ئـەو)ی بـەپێش کەوتبێت :

**لە گوندێ لە گوندەکانی کوردستاندا جووتیارێك هەبوو.**

**خەڵکی ئەم دێیە ئەم خاکەی لە گۆرانیدا پێی ئەڵێن بەهەشتی ڕووی سەر زەمین.**

نیشانەی ناسیاری (ـ ە) لە پێوەلکانی بەناوی کۆدا جیاوازی لەگەڵ نیشانەی (ـ ەکە) هەیە ، چونکە بە کۆتایی نیشانەی کۆ (ـ ان)ەوە دەلکێت:

**بەو پارانە سەرایەکی بۆخۆی دروستکرد.**

**لەناو ئەو ژنانە ژنێك بوو، ناوی شەرمن بوو.**

**لەپاشا ئەم شتانە بسوتێنە.**

بە سەرنج دانی پاشگری ناسیاری (ـ ەکە و ـ ە) لەم رستانەی پێشوودا بزوێنی (ـ ە) (بەبێ جێناوی نیشانە) بەو ناوانەوە دەلکێت، کە لەباسەکەدا هەن:

**مام رۆستەم بە دەوری خەرمانەکەدا ئەسوڕایەوە، لەگەڵیشیا پرتە و بۆڵەی بوو نزاو هەڕەشەی لە ئاغا ئەکرد، پەنای ئەبرد بەر یەزدان، هەتا خەرمانە هیچی نەما. ئینجا ڕووی کردە کوڕەکە و پێی ووت.. کورەش پێی ووت..**

## نیشانەی نەناسیاری

نیشانەی نەناسیاری لەگەڵ ئەو ناوانەی کۆتاییان بە نەبزوێن هاتووە شێوەی (ـ ێك// ـ یێ)دەبێت و لەگەڵ ئەو ناوانەش، کە کۆتاییان بە بزوێن هاتووە لە شێوەی (ـ یێ(ك)// ـ یەك) دا دەبێت.

**میری سۆران لەشکرێکی ڕێك و پێکی پر چەکی پێویست بوو.**

**کە سەرم هەڵبری ئەبینم دەروێشێ لەپاش گیانبازێکی دوور و درێژ بریارمان دا..**

**ئافرەت چایەکەم بۆ تێ بکە.**

**بەرەبەری پاییز بوو، نیوەرۆیەك لەگەڵ پۆلا دانیشتبووین.**

ئەم دارشتنەی ژێرەوە (نیوەرۆیەکی هاوین) لەگەڵ ئەوانەی پێشوو بەراورد بکە، کە لەم داڕشتنەدا نیشانەی نەناسیاری لەشێوەی (ـ ك)دا دەبێت.

ئەو ناوەی لەگەڵ جێناوی نادیاردرا بەکاردێت لەباری کۆی نادیاردا دەبێت و نیشانەی نەناسیاری پێوە دەلکێت:

**پاش چەند دەقیقەییك گەیشتنە قاپییەكی گەورە.**

**لەشەش سالیما هەموو نووسراوێكی فارسیم دەخوێندەوە.**

بەكارهێنانی نیشانەی ناسیاری و نیشانەی نەناسیاری لەم نەخشـەیەی خـوارەوەدا خۆی دەنوێنێت:

| ژمارە | نیشانەی ناسیاری | نیشانەی نەناسیاری |
|---|---|---|
| تاك<br>كۆ | ـ ەكە // ـ یەكە // ـ كە<br>ـ ەكان// ـ یەكان // ـ كان | ـ ێ (ك)//یێ (ك) // ـ یەك// ـ ك |
| تاك<br>كۆ | جێناوی نیشانە ئەم (ـ ەو) .. (ی)ە<br>جێناوی نیشانە ئەم (ـ ەو).. (ی)انە | جێناوی نەناسیار..<br>ێ (ك)// یێ (ك)// یەك//ك |

## نیشانەی كۆ

نیشانەی كۆ برێتیە لە پاشـگری (ـ ان)، بـە لێكدانـی لەگـەڵ نیشـانەی ناسـیاری (ـ ەكە) و (ـ ە) شێوەی (ـ ەكە) و (ـ انە) یان دەبێت.

شێوەی (ـ ان) لەگەڵ ئەو ناوانەدا بەكاردێت، كـە كۆتاییـان بـە نـەبزوێن و بزوێنـی (ـ ە) هاتووە:

**ڕۆژ - ڕۆژان ، شەو - شەوان ،**

**ئێوارە - ئێواران ، مێشە - مێشان ،**

**كوڕ - كوڕان ، ژن - ژنان ،**

نیشانەی كۆ لەگەڵ ئەو ناوانەی كۆتاییان بەبزوێن دێت هەر شێوەی (ان)ی دەبێت، بەڵام (ی) دەكەوێتە نێوان ناو و نیشانەكە و (و)یش تەنیا لەگەڵ ئـەو نـاوەدا دێـت، كـە كۆتایی بە (و) هاتووە:

**چرا - چرایان ، چەقۆ - چەقۆیان ،**

**دێ - دێیان ، دانیشتوو - دانیشتووان ،**

خانوو - خانووان ، کانی - کانی‌یان ، کورسی - کورسییان.

ئەوی لەبەر چاوانە لەبەر دڵانە.

شەوێ لە شەوان یارم هاتە خەو.

هەژاران ئەچوونە دەرەوە و مامۆستایان ئەهاتنە ژوورەوە و دەستیان بە پارانەوە ئەکرد.

پێش هەموویان من سووتاندەی هەندێك لە خانووانی گوندم بەدی کرد.

لەبەشە دیالێکتی سلێمانی هەروا لە شێوەی موکریدا ئەو ناوانەی واتای شت دەبەخشن و لەباری کۆدان دەوری سەرکار (نیهاد) ناگێرن، بەڵکو هەر ڕۆڵی بەشەکانی ناسەرەکی ڕستە (دیارخەر و بەرکار و ئاوەڵگوزارە) دەگێرن

لەپاڵ نیشانەی کۆی (- ان) پاشگری (گەل)یش بۆ گیانداران بەکار دێت هەروا ( - ات // - هات // وات) واتای کۆ دەبەخشن.

مێگەڵ، گاگەل، مەڕ و ماڵات، حەیوانات، سەوزەوات، مێوات // مێوەهات // مێوەجات، خەیالات، باخات و هی دی.

هەروا یەکێك لە تایبەتێتیکانی نیشانەی کۆی (- ان) بەکارنەهاتنێتی لەگەڵ ئەو ئاوەڵکارانەی، کە بەیارمەتی (- ەها) لێکدراون: ڕۆژەهای ڕۆژ، ساڵەهای ساڵ:

بەخودای شەوەهای شەو خەو نەئەچووە چاوم.

هێندێك ناو هەن بەبێ نیشانەی کۆ واتای کۆ دەبەخشن:

هەر چاوی بە منالە وردکە بکەوتایە..

بزەییێك لەسەر زاری پەیدا بوو.

گەلای وەری لقی نەوی.

سەد جەردە لاتێك ڕووت ناکات.

## نیشانەی بانـگـکـردن

لەشێوەی سلێمانیدا کۆتـایی نـاو لـەناوچووە، بـەڵام کۆتـایی دۆخـی بـانگ کـردن پارێزراوە و ماوە، بۆ گیاندار و بێگیان پاشگری (ـ ە / ـ یە) بۆ تاك لەگەڵ ئـەو ناوانـەی کۆتاییان بە نەبزوێن و ـ ینە // ـ ینــە = yne ـ لەگـەڵ ئـەو ناوانـەی کۆتاییـان بـە بزوێـن هاتووە لەباری کۆدا بەکاردێت:

**خاڵە ماندوو نەبی.**

**دایە کارێکی خراپ قەوماوە.**

**دڵە با بەس بێ، دڵە با بەس بێ.**

**دەی جەنگاوەرینە وەرنە مەیدان.**

**رۆڵەیینە خەتای من نییە.**

لـەو بارانـەدا، کـە ناوەکـە بـەهۆی نیشـانەی ناسـیاری ( ـ ە)وە ناسـراوە، (ـ ە)ی دۆخی بانگکردن لەنێودەچێت و بەکارنایەت، ئەم دوو دارشتنەی ژێروو بەراورد بکە:

**باوکە گیان ! و باوکی خۆشەویستم.**

لەگەڵ ئەو دیارخەرە، کە برێتیە لەجێناوی لکاو (ـ ە) بەکارنایەت:

**باوکم چیت ئەوێ؟**

**کورم تۆ نەخۆشی و بێ هێزی..**

لەپاڵ بزوێنی (ـ ە)دا شێوەی (ـ ێ)ش لەگـەڵ ئـەو ناوانـەی رەگـەزی مێیـان هەیـە بەرچاو دەکەوێت و بزوێنی (ـ ۆ) بۆ ئەو ناوانەی رەسەنیان نێرە:

**خوشکێ، کچێ، پوورێ، خاڵۆ**

**خوشکێ کێمان مردووە ؟**

**پوورێ پەنجەرەکە دابخە.**

**خاڵۆ ماڵەکەی فلان کەس لە کوێیە؟**

ناوی کەسی نیشانەی بانگ کردن وەرناگرێت. هێندێك وشە هەن، کە دەکەونە پێش

ناوی کەسێوە و دەوری دۆخی بانگ کردن دەگێڕن و نیشانەی بانگکردنیش وەردەگرن وەیا شێوەی وشەکە بەجۆرێکە نیشانەکە وەرناگرێت:

کاکە (بۆ بانگ کردن و ئاگادار کردنی کەسێك وەیا یەکێك، کە لە قسەکەر بەتەمەن گەورەترە).

بابە، خاڵە، مام، خوشکە، پوورە (بۆ بانگکردن و ئاگاداریکردنی ئافرەتێك، کە بەتەمەن لە قسەکەر گەورەترە).

## ئاوەڵناو

ئاوەڵناو تایبەتێتی خۆی هەیە، کە بەم نیشانە مۆرفۆلۆژی و سینتاکسیانەی خوارەوە دەست نیشان دەکرێت.

ئاوەڵناو لەڕووی واتاوە چۆنیەتی و نیسبی دەگرێتەوە (نسبیش هەر چۆنیەتییە) لەلایەن پێکهاتنێوە: سادە (ئەوانیش هەر چۆنیەتین) و دارێژراوە ـ بەهۆی پاشگر و پێشگرەوە، هەروا لێکدراویشی هەیە، کە ئاوەڵناوی چۆنیەتی و نیسبیش دەگرێتەوە. (بڕوانە بابەتی پێشگر و پاشگر).

جیاوازی ناو لەگەڵ ئاوەڵناودا لەڕووی دارشتنێوە هۆی پێکهاتنیانە، کە ئاوەڵناو لەچاو ناودا زێتر بەیارمەتی پاشگرەوە دادەرێژرێت، بەڵام ناو بەهۆی پێشگرەوە پێك دێت (دیسانەوە بڕوانە بابەتی پێشگر و پاشگر). ئاوەڵناوی چۆنیەتی بەپێی پلەی بەراوردی دەگۆرێت:

### پلەی بەراوردکاری

بەهۆی پاشگری (ـ تر) دادەرێژرێت و بە یارمەتی ئامرازی پێوەندی (لە):

ئەم ساتە زانیم، کە لە ماچی سەرکوڵمی ئاتە شیرینتر و بەتامتر نییە.

**لەڕی خۆت لەچاخی خەلك چاکترە.**

**ئەم کوڕە لە براکەم زیرەکترە.**

**پلەی باڵا**

بەیارمەتی پاشگری (ـ ترین) دادەڕێژرێت:

**بەدترین: لە بەد بەدترە، بەد لە بەدترین چاکترە (پەند)**

**بابە: با بچووکترین پارچە بێت.**

لەوانەیە هێندێك جار جێناوی (هەرە)ش لەگەڵ پاشگری (ـ ترین) بەکاربێت:

**عەرەبانە چکۆلانەکەی لە هەرە گەورەترین شووتی بارکرد.**

ئەم وێنەیەی خوارەوە لەگەڵ ئەوانەی پێشووتردا بەراورد بکە، لەپلەی باڵای ئاوەڵناوەکەی هەر بەهۆی زمانەوە دەربڕاوە.

**هیوای هەرە گەورە ئەوە بوو دڵی مێردەکەی لێ نەرنجێت.**

ئەو ئاوەڵناوانەی ڕەنگ پێشان دەدەن بە یارمەتی پاشگری (باو) و (کار) پلەی جۆری ڕەنگەکە زێتر روون دەکەنەوە:

**زەرد باو ، سپیکار، سووورباو ، ڕەشباو و هی دی.**

زۆربەی ئاوەڵناوی چۆنیەتی بەهۆی پاشگری (ـ ایی)، (ـ ی)، کە دەکەونە کۆتاییەوە ناو دادەڕێژن:

**شین - شینایی**

**ڕەش - ڕەشایی**

**فێنك - فێنکایی**

**کوێر - کوێرایی**

**گەرم - گەرمایی**

**سارد - ساردایی**

درێژ - درێژایی

ئاوەڵناوی دارێژراو و چەند ئاوەڵناوێکی سادەش هەروەکو ناو بە یارمەتی پاشگری (- ی) ناوی میناکی دادەرێژن:

ناخۆش - ناخۆشی

بێکار - بێکاری

سەربەست - سەربەستی

رووسوور - رووسووری

شیرین - شیرین

کورت - کورتی

شۆخ - شۆخی و هی دی.

بەشێوەیەکی گشتی ئاوەڵناو لەکاتی‌نەبوونی ژمارەدا، ژمارەش پێشان دەدات، هەروا ناسیاری و نەناسیاری، بەڵام لەهێندێك باردا، کە ئاوەڵناو ئەرکی سینتاکسی خۆی دەگێرێت لەوانەیە نیشانەی ناسیاری و نەناسیاری و پاشکۆی ئامرازی پێوەندی و جێناوی لکاوی کەسی پێوە بلکێت.

## ئاوەڵناو و ئەرکی سینتاکسی

ئاوەڵناو لەڕستەدا ئەم دەورانە دەگێرێت:

١ـ دیارخەر (لەگەڵ ناو و کاردا).

٢ـ بەشی ناوی وشەیکار ( گوزارە).

ئاوەڵناو کە دەوری دیارخەر دەگێرێت و لەگەڵ ناودا دەبێت دەکەوێتە دوای ناوەوە و بەهۆی ئامرازی خستنەسەرەوە بەیەکەوە، بەندیواری پەیدا دەکەن و وشەی لێکدراوی دیارخەری پێك دەهێنن (بروانە باسی داهاتووتر)، بەڵام ئەو ئاوەڵناوەی

دەوری دیارخەر دەگێڕێت و لەگەڵ کاردا دێت، ئەوا هەمیشە بەپێش کارەکە دەکەوێت:

**زووتر و چاکتر ئەکات.**

**جوان بنووسە.**

**من خۆم و خێزانەکەشم تێرمان لیٚ خوارد.**

لەو بارانەدا، کە ئاوەڵنـاو دەبێتـە بەشـێکی وشـەیکار (گـوزارە) لەپلـەی ئاسـایی و بەراورددا دەبێت:

**ئەم کچە چەند جوانە!**

**هەتا ئەهات لەشم گرانتر و خاوتر ئەبوو.**

### دارشتنی خستنە سەر

لەشێوەی سلێمانیدا دوو جۆرە نیشانەی خستنە سەر هەیە:

(i - ی// y - ی) دەکـەونە دوای ئەو نـاوانـەوە، کە کـۆتـاییان بە بزوێـن هـاتووە، (- ە) و (- یە) دوای ئەو ناوانەوە دێـن، کـە کۆتاییـان بـە (- ی) هـاتووە، (- وە)ش دوای ئەو ناوانەی کۆتاییان بە (- وو) دێت.

خستنەسەری (-ی // Î -) لەم بارانەی خوارەوەدا بەکاردێت:

١) لەگەڵ ئەو ناوەی تاکە وەیا کۆیە یان لەباری ناسیاری دایە.

آ - لەگەڵ ئاوەڵناوی چۆنیەتی ونیسبی:

**رەشکۆ دوو چاوی ڕەشی جوانی وەك ئەستێرە گەش کردەوە.**

**ئاسنی سارد ئەکوتیٚ (پەند).**

**منیش بەدەستی بەتاڵەوە گەرامەوە.**

ب ـ لەگەڵ ناو و جێناودا:

**کەر بۆنی زەعفەران نازانێ . (پەند)**

**ئەبێ پێشکەشیان بکەی بۆ کوڕانی پاشا.**

**بە ئارەزووی خۆم ئەکەم.**

**گەیشتە سەری ئەو کۆڵانەی ماڵەکەی تێدایە.**

٢) دەکەوێتە کۆتایی ئەو ناوە نەناسراوەی بەهۆی نیشانەی نەناسیارێوە لەدۆخی دیارخەری داڕێژراوە :

آـ لەگەڵ ئاوەڵناوی چۆنیەتی و نسبیدا:

**کوتکێکی داری دەرهێنا و پڕی کرد لە ئاو.**

**لەم کاتەدا سەگێکی بۆری بچکۆڵە بەلایا تێپەری.**

**لەبەر دەرگای خانوویەکی بەرز دابەزین.**

ب ـ ناو و جێناو

**زۆر زوو هەموو کون و کەلەبەرێکی بەندیخانەکەی شارەزا بوو.**

**لەم شارەدا کابرایەکی حەکیم هەبوو**

**ئەبینین کابرایەکی کەپەنگ بەشان لە دوورەوە رووی کردە ئاوایی.**

٣ـ لەگەڵ ئەو ناوانە دێت، کە لەباری تاك وەیا کۆدا دەبن و نیشانەی ناسیاری (ـ ەکە) و (ـ ە) یان پێوە لکاوە.

**لەسەر سەبیلەکەی باوکیان ئەچوون بە گژ یەکا.**

**ئایا ئەم پاشایەی ئێمە منی بۆ چییە؟**

**موو سپێکانی برژانگی ئەوەندەی نەمابوو چاوە هەڵقرچاوەکانی داپۆشێ.**

خستنەسەری (ـ ە) لەو بارانەدا بەکاردێت، کە ناوی دیارخراوی وشەی لێکدەری

برێتی دەبێت لە ئاوەڵناوی نسبی، لەم جۆرە خستنەسەرەدا نیشانەی ناسیاری ، کە بە ناوی دیارخراوەوە بەندە بە دیارخەرەوە دەلکێت ، ئەگەر زنجیرەیەك دیارخەر بوون ئەوا بەهەرە دووا دیارخەرەوە دەنووسێت، بەڵام پێوەندی نێوان ناوەکان بەیارمەتی ئامرازی خستنەسەری (ـ ە) دەبێت:

**شەوی دڵ تاریك باڵە رەشەکانی خۆی بەلای ڕووی بەفرە سپیەکەدا ئەدات.**

**بەڵام دەزگای تازە ئەم کارە گرانە بەئاسانی بەدی هێنا.**

**فرمێسك وەکو تەرزە و باران لەچاوە سوور هەڵگەراوەکانی ئەهاتە خوارێ.**

کەچی هێندێك جار خستنەسەری (ـ ە) دەکەوێتە نێوان دیارخەر و دیارخراوەوە بێ ئەوەی نیشانەی ناسیاری لەنێو وشە لێکدراوە دیارخەرێکەدا هەبێت، ئەم جۆرە داڕشتنەی وشەی لێکدراوی دیارخەری ئەم دوو گروپەی خوارەوە دەگرێتەوە.

١ـ وشەی لێکدراوی دیارخەری چۆنیەتی، کە نیشانەی دۆخێکی چەسپیوی ناوی دیارخراو دەست نیشان دەکات:

| | | | |
|---|---|---|---|
| **شەوەزەنگ** | ، | **کەرە دێزە** | ، |
| **سەگە خوێری** | ، | **سەگە وەفادار** | ، |
| **نانە رەق** | ، | **خوشکە گەورە** | ، |
| **ئاشەکۆن** | ، | **گورگە بۆر** | ، |
| **کچە جوان** | ، | | |

**لەژێر باڵی شەوە زەنگا بەنشێو و نزارا ئەڕۆیشتن.**

لەگەڵ ئەو ڕستانەی خوارەوەدا بەراوردی بکە، کە نیشانەی ناسیاری لەنێو وشەی لێکدراوی دیارخەردا بەکارهاتووە:

**هەرچۆنێ بوو بەو شەوە زەنگە برینەکانمان پێمان و ..**

**لەنانە ڕەق زیاتر هیچی کەی تیا نەبوو.**

**چووین بۆ لای کەرە دێز، ڕوانی کەرەدێز ئەو کەڕە دێزەی جاران هیچی نەماوە.**

ئەو ڕستەیەی هەرە ژێروو لەگەڵ ڕستەی داهاتوودا بەراورد بکە، کە خستنەسەری (- ی) لەبریتی (- ە)ی تێدا بەکارهاتووە.

**کەری دێز تۆپینی خۆی و زیانی خاوەنی ئەوێ.**

٢ـ ئەو وشە لێکدراوەی، کە دیارخەرەکەی چۆنیەتی نێوی دیارخراوەکە دەست نیشان دەکات و لەگەڵیدا دانەیەکی بیری یەکگرتوو پێشان دەدات:

**کوڕە پاشا** لەگەڵ **(کوڕی پاشا)**ی بەراورد بکە.

**کچە شوان** لەگەڵ **(کچی شوان)**ی بەراورد بکە.

**کونە مشك، ژنە لادێی، ژنە ئاشەوان، کوڕە لادێی، تووتەڵەسەگ ، توێکڵە شووتی، دارە هەرمێ، کلکە ڕێوی** لەگەڵ **(کلکی ڕێوی)**دا بەراورد بکە و **کچە کورد** و هتد.

خستنەسەری (- ە) لەم وێنانەی سەرەوەدا زۆر لەو بارانەدا بەکاردێت، کە دیارخەر بریتی دەبێت لە وشەیەك واتای ناو و ئاوەڵناو و هەڵ دەگرێت دیارخەرەکەش مانای خاوەنیەتی دەگەیەنێت، هەروەکو بەکارهێنانی خستنەسەری (ی - Î ) .

**خاتوو مەنیج وێنەیەکی ڕاستەقینەی ژنە لادێی خۆمان بوو.**

**لەگەڵ (ژنی لادێی)دا بەراوردی بکە.**

**کابرایەك بوو بە میوانی ماڵە کوردێك.**

**لەو دیوی شیشە ئاسنەکەوە دەستم ڕاکێشا.**

**لەگەڵ (ئێمەش خۆمان دا بەسەر شیشە ئاسنینەکانی پەنجەرەکانا).**

لەڕستەی یەکەمدا ناوی (ئاسن) و لە ڕستەی دووەم دا ئاوەڵناوی (ئاسنین) دەوری دیارخەریان گێراوە، باوەکو لەنێوان ئەم وشە لێکدراوە دیارخەرانەدا پێوەندێکی واتایی

بەهێز هەیە، بەڵام وشە لێکدراوەکان بۆیان هەیە نیشانەی ناسیاری و نەناسیاریش بێنە سەریان، بێگومان لەگەڵ ئەو وشە لێکدراوانەش، کە بەیارمەتی خستنەسەری (- ە) لێکدراون:

**ئەگێڕنەوە، کە کوڕە گەورەیەك لە ڕاو چاوی بەکچە شوانێك ئەکەوێت، زۆری حەز لێ ئەکات.**

**ئەیبەن هەتا ئەگەنە بەر کونە ورچێك، کە تاریکی بەسەردا داهات تووشی ئاشە کۆنێك بوو.**

لەگەڵ ئەم ڕستەیەی خوارەوەدا بەراوردی بکە:

**بەدبەخت، کە گەیشتە ئاشە کۆنەکە.**

هەروا تێبینی ئەوەش دەکرێت، کەوا نیشانەی نەناسیاری دەکەوێتە پێش نێوی دیارخراوەوە بۆ ئەو مەبەستە ئەم دوو رستەیەی خوارەوە بەراورد بکە:

**کوڕێکی لادێی بەلایدا ڕۆیشت.**

**و**

**کوڕە لادێییەك هات.**

بەم جۆرە لە شێوەی سلێمانیدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، کەوا پێوەندی وەسفی نێوان وشەی لێکدراوی دیارخەری لەڕووی ناسیاری ناو و جۆری دیارخەرەوە دابەش دەکرێتە سەر دوو شێوەی دیارخەری خاوەنیەتی لەگەڵ خستنەسەری (- ی) و چۆنیەتی لەگەڵ خستنەسەری سەری (- ە) دا:

لە وشەی لێکدراوی سەربەخۆدا، کە بە یارمەتی خستنەسەری (- ی) لێك دراون و دوو وشەی لێکدراوی دیارخەری لێك دەدات، لەلایەن دارشتنەوە دەتواندرێت وەکو دارشتنێکی چەسپیو تەماشا بکرێت، بۆ وێنە:

**(نانە ڕەق)** لەگەڵ **(نانە کوێر)**دا بەراورد بکە.

نیشانەی بنچینەیی ئەو وشە لێکدراوانەی، کە بە یەکەوە دەنووسرێن، هێندرێك

جار پشت گوێ دەخرێت. ئەندازەی سنووردانانی وشەی لێکـدراوی دیارخـەری ئەمانـەی خوارەوە دەگەیەنێت:

آ - بەردەوام بوون لە قسەکردندا.

ب - واتای وشەکە (وشە لێکدراوەکە واتایەکی نوێ دەبەخشێت، کە لەوانەیـە بـەندیواری بە واتای ئەو وشانەوە نەبێت کە لێی پێکهاتوون).

پ) نەتوانینی لکاندنی نیشانەکە بە وشەی یەکەمی وشە لێکدراوەکە.

## دارشتنی ناو

پاشگر و پێشگر بەهۆیەکی سەرەکی دارشتنی ناوی دارێژراو دەژمێردرێن، هەروا یارمەتی دارشتنی وشەی لێکدراویش دەدەن.

## پاشگری ناو

ئەو پاشگرانەی ناو دروست دەکەن، واتای میناکی پێ دەبەخشن:

آ) - ی // - یی، آیی // آیەتی، (- ی) - ەتی// - (ی) ێتی.

(ئەم پاشگرانە بەناو و ئاوەڵناوەوە دەلکێن):

**منداڵی، سەپانی، ئازایی // ئازایەتی، فێنکایی، کوێرایی، خۆشی، شیرینایی، کەمی // کەمێتی، راستی، برایەتی، پیاوەتی، برسییەتی // برسێتی، لاوێتی** و هی دی.

ب) - ێنی (کەم بەکاردێت و بەناوەوە دەلکێت).

**کچێنی، لاوێنی، کورێنی، بووکێنی** و هی دی.

هێندێك پاشگر هەن ، کە دەچنە سەر ناو پیشە و جۆری کار پێشان دەدەن:

آ) - ەوان // وان، گەر، کەر، کار، ساز، باز، چی (بە ناوەوە دەلکێن):

**نانەوا، ئاشەوان، گاوان، گۆزەکەر، چاپ کەر، دادگەر، راوکەر، مۆمکەر، کرێکار، خزمەتکار، سەعاتساز ، چاوباز، کۆترباز، قومارباز، پینەچی، ئێشکچی** (سێ پاشگری هەرە دوایی کەم بەکاردێن).

ب) - یار، - ەر

دەچنەسەر رەگی کاری رانەبردوو:

**فرۆشیار // فرۆشەر، کریار، بریار، نووسەر، تێکۆشەر** و هی دی.

هێندێك پاشگر هەن ، کە دەچنە سەر ناو واتای شوێنی پێ دەبەخشن:

آ) - گا، - گە

**کارگا // کارگە، کانگا // کانگە، گوزەرگا، راوگە، رێگا // رێگە** و هی دی.

ب) ـ ستان

**کوردستان، کوێستان، دارستان، گۆرستان، چڕستان** و هی دی.

پ) ـ زار

**گوڵزار، پەموزار، مێرگزار، نەیزار** و هی دی.

ج) ـ لان // ـ (ە) لان:

**خوێیەلان، بەردەلانی، بێشەلان، جۆمەلانی** و هی دی.

چ) ـ دان

**فیشەکدان، کادان، ئاگردان، مۆمدان، تیردان** و هی دی.

پاشگری ـ ێن، کە دەچێتە سەر ناو ناوی یاری دادەرێژێت:

**نەردێن، قاپێن، تۆپێن، هەلوکێن، ماڵ ماڵێن، غارغارین.**

کە پاشگری (ـ ینە) بەناو بەزۆری و بە ئاوەڵناوەوە بە کەمی دەلکێت:

**گەنجینە، پووشینە، قیرینە، زەردینە** و هی دی.

پاشگری ـ ە بەناو، ئاوەڵناو، ژمارە و رەگی کارەوە دەلکێت و ناوی جۆراوجۆر دروست دەکات:

**دەستە** (دەست)، **ئاگرە** (ئاگر) **رووتە** (رووت)، **چاکە** (چاک)، **گەرمە** (گەرم)، **ووردە** (وورد)، **چلە** (چل)، **هەفتە** (هەوت)، **سەدە** (سەد)، **کردە** (کرد)، **وێرانە** (وێران) و هی دی.

پاشگری ـ ش (ت) // ـ یشت:

**مالشت، کۆششت، گەشایشت، بەخشایشت** و هی دی .

پاشگری ( ـ ێنە)

پاشگری ـ ێنە کەم بەکاردێت، کە دەچێتە سەر ناو و ئاوەڵناو شێوەی دارێژراویان لێ پێك دەهێنێت:

| | |
|---|---|
| زەردێنە | لە ئاوەڵناوی (زەرد)ەوە داڕێژراوە |
| سپێنە | لە ئاوەڵناوی (سپی) |
| پشتێنە | لەناوی شوێن (پشت) |
| نیسکێنە | لەناوی (نیسك)ەوە. |
| گلێنە | لەناوی (گل)ەوە. |

پاشگری (- وو)ش کەم بەکاردێت و بە کۆتایی هێندێك ناو و ئاوەڵناودا دەلکێت:

**ڕۆژوو، پاروو، چزوو، جووانوو، تاڵوو، خواروو** و هی دی.

## ئەو پاشگرانەی ناو و ئاوەڵناو دادەڕێژن

پاشگری ـ انە:

| | | |
|---|---|---|
| سەرانە | لە | سەر |
| جووتانە | لە | جووت |
| ئاشانە | لە | ئاش |
| شاگردانە | لە | شاگرد |
| لەرزانە | لە | لەرز |
| چاکانە | لە | چاك |
| مۆردانە | لە | مۆرد |
| ژنانە | لە | ژن |
| مناڵانە | لە | مناڵ |
| پیاوانە | لە | پیاو |
| مانگانە | لە | مانگ |
| ڕۆژانە | لە | ڕۆژ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| شەیتانە | لە | شەیتان | |
| برایانە | لە | برا | وەی دی |

پاشگری ـ انی:

| | | | |
|---|---|---|---|
| ووشکانی | لە | ووشك | |
| پێشانی | لە | پێش | |
| کوڕانی | لە | کوڕ | |
| نەرمانی | لە | نەرم | |
| ڕەقانی | لە | ڕەق | |
| کچانی | لە | کچ | |
| ژنانی | لە | ژن | |
| شەڕانی | لە | شەڕ | |
| ڕقانی | لە | ڕق | |
| هەقانی | لە | هەق | وەی دی. |

پاشگری ـ ندە (کەم بەکاردێت)

| | | | |
|---|---|---|---|
| دەسندە | لە | دەس | |
| باڵندە | لە | باڵ | |
| فڕندە | لە | فڕ (ڕەگی چاوگی فڕین) | |
| شەرمندە | لە | شەرم | |
| درندە | لە | دڕ (ڕەگی چاوگی دڕین) | |
| بڕندە | لە | بڕ (ڕەگی چاوگی بڕین) | وەی دی؟ |

پاشگری - ەوار // - وار (کەم بەکاردێت)

| | | |
|---|---|---|
| خوێندەوار | لە | خوێند (ڕەگی چاوگی خوێندن) |
| شینەوار | لە | شین |
| زستانەوار | لە | زستان |
| لێڕەوار | لە | لێر |
| سزاوار | لە | سەزا |
| بەندیوار | لە | بەندی |

ئەو پاشگرانەی ئاوەڵناو لەناو و - ڕەگی کار دادەڕێژن -

پاشگری - (ی) ی

بەکۆتایی ناوەوە دەلکێت و ئاوەڵناوی داڕێژراو دادەنرێت:

| | | |
|---|---|---|
| منداڵی | لە | منداڵ |
| شەرابی | لە | شەراب |
| شەوی | لە | شەو |
| هێلکەیی | لە | هێلکە |

پاشگری (- ن - ین)یش بە کۆتایی ناوەوە دەلکێن و ئاوەڵناوی داڕێژراوی لێ دادەڕێژن:

| | | |
|---|---|---|
| شەرمن | لە | شەرم |
| کرمن | لە | کرم |
| وورگن | لە | وورگ |
| تووکن | لە | تووک |
| زێڕین | لە | زێڕ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| زێوین | لە | زێو | |
| دێرین | لە | دێر | |
| ئاگرین | لە | ئاگر | |
| رەنگین | لە | ڕەنگ | وهی دی |

پاشگری - اوی -

ئەم پاشگرەش بەناوەوە دەلکێت و ئاوەڵناوی دارێژراوی لێ پێك دەهێنێت:

| | | |
|---|---|---|
| ئارداوی | لە | ئارد |
| ژەنگاوی | لە | ژەنگ |
| نماوی | لە | نم |
| خوێناوی | لە | خوێن |
| تۆزاوی | لە | تۆز |
| فێڵاوی | لە | فێڵ و هی دی |

پاشگری - دار

پاشگری - دار بەکۆتایی ناوەوە دەلکێت و ئاوەڵناوی دارێـژراوی لێ پێکدەهێنێـت و واتای خاوەنێتیشی پێ دەبەخشێت:

| | | |
|---|---|---|
| ئابڕودار | لە | ئابروو |
| بۆندار | لە | بۆن |
| بریندار | لە | برین |
| ڕیشدار | لە | ریش |
| ژەنگـدار | لە | ژەنگ |
| ماڵدار | لە | ماڵ |

| خاڵدار | لە | خاڵ | وهی دی.. |
|---|---|---|---|

پاشگری - (ن) ۆك

ئـەم پاشگرە بـە کۆتـایی رەگـی کـارەوە دەلکێـت و ئاوەڵنـاوی دارێـژراوی لێ دادەرێژرێت و کەم بەکاردێت:

| گرینۆك | لە | گری (رەگی چاوگی گرین) |
|---|---|---|
| ترسنۆك | لە | ترس (رەگی چاوگی ترسان) |
| گەرۆگ | لە | گەڕ (رەگی چاوگی گەڕان) |
| پەرۆك | لە | پەڕ (رەگی چاوگی پەڕین) |
| بەزۆك | لە | بەز (رەگی چاوگی بەزین) و هی دی. |

پاشگری - ەکی

بەکۆتایی ناوەوە دەلکێت و ئاوەڵناوی دارێژراوی لێ دادەرێژێت و کەم بەکاردێت:

| ئاوەکی | لە | ئاو | |
|---|---|---|---|
| دەشتەکی | لە | دەشت | |
| بەیانەکی | لە | بەیان | |
| پوولەکی | لە | پوول | |
| کەرەکی | لە | کەر | وهی دی. |

پاشگری ـ مەند

بەکۆتایی ناوەوە دەلکێت و ئاوەڵناوی دارێژراوی لێ دادەرێژێت:

| | | |
|---|---|---|
| ئارەزوومەند | لە | ئارەزوو |
| رەزامەن | لە | رەزا |
| بەهرەمەند | لە | بەهرە |
| نیازمەند | لە | نیاز |
| تاسەمەند | لە | تاسە و هی دی. |

**پاشگری بچووک کردنەوە و نازکی**

ئەم جۆرە پاشگرانە دەچنە سەر ناو و ئاوەڵناوی سادە ئاو و ئاوەڵناوی دارێـژراوی لێ دادەرێژن و واتای بچووک کردنەوە و نازکی پێ دەبەخشن:

**پاگشری ـ ۆلە // ۆڵە، ئۆلکە // ئۆڵکە:**

**کچۆلە، کیژۆلە، تەشتۆلە // تەشتۆڵکە سەبەتۆلکە، گردۆلکە، شاخۆلکە، نەرمۆلـە، نازۆلکە** و هی دی.

پاشگری ـ (ە) لە // ـ (ە) ڵە، ـ کەلە ـ کەڵە، ـ یلە، ـ یلکە:

**برالە، بابیلە، خانوولە، گردەڵە، نەرمیلە، سپیکەلە، سوورکەلە، چاویلکـە** ـ لـەرووی زمانەوانێوە لەگەڵ (چاو) دا بەراوردی بکە.

| | | |
|---|---|---|
| خوریلکە | لە | خوروو |
| رووتەڵە | لە | پووت |
| شرۆڵە | لە | شڕ |
| خڕکەلە | لە | خڕ |
| گۆزەڵە | وهی دی. | |

پاشگری ـ ووڵە، ـ وولکە

جاشوولە // جاشوولکە، خانوولە، زەنگوولە، دانوولە، جوانوولکە،

مێشوولە لە مێش

مێروولە لە مێروو

خوڕوولکە وهی دی.

پاشگری ـ چە، ـ چکە، ـ ۆچکە:

**خانووچکە، خوانچە، بێڵچە، بێڵۆچکە، گوێچکە، ئاگرۆچکە، گوریچـە، سـندووقچە، نیمچە، پارچە، باخچە، کەمانجە و هی دی.**

پاشگری ـ کە، ـ ۆك، ـ ۆکە، ـ ەك، ـ ك:

**کچکە، گردکە // گردۆکە، ساردکە، چەرك // چەرۆك، جووجك، لانکە // لانك، پووشکە، تەپۆکە، پوولـە، لووتکـە لـە (لـووت)، ئەسـتوورکە (لـە ئەسـتوور) (ئەسـتووك نـەك** ئەستوورکە و هەر لەناوچەی هەولێر بەکاردێت، نەك سلێمانی ـ وەرگێر).

**سپیکە، بووکۆکە لە (بووك)، پیازۆك لە (پیـاز)، رەشـۆك لـە (رەش)، پنـك // پنـۆك لـە (پن) و هیدی***.

## پێشگر

پێشـگر لـە دروسـتکردنی نـاودا بـە کەرەسـتەیەکی زۆر کاریگـەر دەژمـێردرێت (بەشێوەیەکی زیاتر ئاوەڵناو) هەروا کاری داڕێژراویش دادەڕێژرێت (بڕوانە بابەتی کـاری داڕێژراو).

ئەو پێشگرانەی خوارەوە هاوبەشی داڕشتنی ئاوەڵناوی داڕێژراو دەکەن:

پێشگری بە ـ کە ئاوەڵناو لەناو دادەڕێژێت: بەکەڵك (کەڵك)، بەشـوو (شـوو)، بـەدڵ (دڵ)، بەقین (قین)، بەسەبر (سەبر)، بەشەرم (شەرم) بـەوەفا (وەفـا)، بـەجێ (جـێ) و هتد.

پێشگری بێ دەچێتە پێش ناو و ئاوەڵناو دادەڕێژێت:

بێ ئاو (ئاو)، بێ بن (بن)، بێ شەرم (شەرم)، بێ کەس (کەس)، بێ دین (دین)، بێ ناو (ناو)، بێ ڕوو (ڕوو)، بێ مێشك (مێشك) و هتد.

پێشگری بـ - (کەم بەکاردێت)، دەکەوێتە پێش بناخەی کاری ڕانەبوردوو ئاوەڵناو و ناوی لێ دادەڕێژێت:

بزان (زان - رەگی کاری ڕانەبوردووی زانین - ە)

بجەنگ (جەنگ - رەگی کاری ڕانەبوردووی جەنگین - ە)

بکڕ ( کڕ - رەگی کاری ڕانەبوردووی کڕین - ە)

بکوژ (کوژ - رەگی کاری ڕانەبوردووی کوژتن - ە)

بڕان ( ڕان - رەگی کاری ڕانەبوردووی ڕانین - ە) وهتد.

پێشگری نا - بەپێش ناو و ئاوەڵناو دەکەوێت ئاوەڵناوی ناکراو دادەڕێژێت:

نابەجێ (بەجێ)، ناشیرین (شیرین)، نافام / نەفام (فام)، نا بەدڵ (بـەدڵ)، ناتـەواو (تەواو)، نادیار (دیار) ناساغ (ساغ)، ناپاك (پاك) و هتد.

پێشگری (نە -) پێش رەگی کارە و دەکەوێت و ناوی بکەر و کراوی لێ دادەڕێژێت:

نـەمر (مـر - رەگـی کـاری ڕانـەبوردووی مـردن - ە)، نـەهات (هـات - رەگـی کـاری رابوردووی هاتن - ە)

نەخواز (خواز - رەگی کاری ڕانەبوردووی خواستن - ە)

نەگەییو (گەییو - ناوی کراو - رەگی کاری رابوردووی گەیشتن - ە)،

نەناسراو (ناسراو - ناوی کراوە - رەگی کاری رابوردووی ناسین - ە).

نەیار (یار)، نەخۆش (خۆش)، نەخوێندەوار (خوێندەوار)، نەزان (زان - رەگی کاری ڕانەبوردوو) و هتد.

پێشگری هاو - پێش ناو دەکـەوێت، نـاو و ئاوەڵنـاوی دارێـژراو دادەڕێژێـت و واتـای نوێی پێ دەبەخشێت لەرووی یەکبوون و هاوەڵێتیان.

هاوکار (کار)، هـاوڕێ (ڕێ)، هاوبـەش (بـەش)، هـاوجۆر (جـۆر)، هاوسـاڵ (سـاڵ)، هاودەم (دەم)، هاوسەنگ (سەنگ) و هتد..

## وشەی لێکدراو

وشەی لێکدراو بەهۆیەکی کاریگەری فرە بـەکارهاتووی وشـەڕۆنان دەژمێردرێت لـە ناوچەی سلێمانیدا. ئەم نیشانانەی لەمەودوا باسـیان دەکـەین بـە بنچینـەی جۆرەکـانی وشەی لێکدراو دادەندرێن، وەك:

أ ـ ژمارەی بەشەکانی وشەی لێکدراو.

ب ـ چۆنیەتی و چەشنی پێوەندی نێوان وشە لێکدراوەکان.

پ ـ وشەی لێکدراو چوونەوەسەر بۆ بەشێك لە بەشەکانی ئاخافتن.

بەشێوەیەکی گشتی وشەی لێکدراو برێتی دەبێت لە دوو وشە وەیا هێندێك جـار لـە سێ وشە، کە بەهۆی پێوەندی لێکدەری سینتاکسێوە وەیا گەیەنەرەوە بەیەکـەوە لێـك دەدرێن.

وشەی لێکدراو بـەهۆی ئـامرازی لێکـدەری (و، بـە، او // ەو)وە لێکدەدرێـت، وەیـا بەهۆی لێکدانی بێ ئامراز. بەشەکانی ئـەم جـۆرە وشـە لێکدراوانـە (لەوانەیـە برێتـی بـن لەناو، ئاوەڵناو، جۆرەکانی کار و ژمارە). ئەم وشە لێکدراوانە زۆر کەم لە ڕووی نـێزیکی واتاوە وەیا دژ واتاوە لێك دەدرێن. واتای لێکسێکی وشـەی لێکـدراو پێوەسـتە بـەواتای ئەو وشانەی لێی پێك هاتوون و سەربەخۆش واتادارن، تەنیا ئەو وشە لێکدراوانـە نـەبن، کە لە دوو وشە دارێژراون و یەکێکیان کە بـەزۆری یەکەمیانـە و بەتـەنیا واتـا نابەخشـن، بەڵام ئەو وشانەی کە بەهۆی پێوەندی لێکـدەرەوە لێکدەدرێـن لـە بەشـەکانی ئاخـافتن پێکهاتوون و بەهۆی بزوێنی (ـ ە) وەیا بەهۆی لێکدانەوە پێك دێن و دادەرێژرێن.

## جۆرەکانی وشەی لێکدراو

۱ـ ناو + ناو = ناو

دەم و چاو ، ئیش و کار[19] ،

سەر و گوێلاك ، گەمە و گاڵتە ،

نان و خوان ، پارە و پوول ،

ژن و ماڵ ، بەرد و بناخە ،

جل و بەرگ ، تاو و توان ،

لێو و کچ ، ناو و نیشان ،

نان و چا ، کەس و کار ،

ئاو و هەوا و هی دی.

۲ـ ئاوەڵناو + ئاوەڵناو = ئاوەڵناو

خوار و خێچ ، لەڕ و لاواز ،

شێت و شەیدا ، ڕەش و ڕووت ،

ڕەش و سپی ، نەرم و نۆڵ ،

توند و تیژ ، تەڕ و تازە ،

تازە و نوێ ، تاریك و ڕوون ،

تاس و لووس ، و هی دی.

۳ـ بناخەی کار + بناخەی کار = ناو

هات و چۆ ، گفت و گۆ ،

هات و نەهات ، کرد و کۆش ،

مشت و ماڵ .

**٤ـ ئەم بارانەی خوارەوەش بەرچاو دەکەوێت:**

**آ ـ ناو + وشەی بێ واتا = ناو**

ماچ و موچ ، شت و مت ،

چاڵ و چۆڵ ، پرت و بۆڵ ،

خەرت و پەرت // خرت و پرت وهی دی.

**ب ـ ئاوەڵناو + وشەی بێ واتا = ئاوەڵناو**

لووس و پووس ، فش و فۆڵ ،

خڕ و مڕ ، خڕ و پڕ ،

خڕ و خۆڵ ، لینج و فینج ،

گێژ و وێژ ، گورج و گۆڵ ،

شڕ و پڕ و هی دی.

**٥ـ دووبارەکردنەوەی وشە:**

ئەم جۆرە وشە لێکدراوانە بۆیان هەیە بەبێ یارمەتیدانی ئامرازی پێوەندی لێك بدرێن، وەیا بەهۆی ئامرازی (بە، و ، او // ـ ەو)ە، لە دووبارەکردنەوەی وشەدا واتای خۆی دەپارێزێت و ئەم چەشنە وشە لێکدراوانەی لێ پێکدێت:

١ـ لەدووپات کردنەوەی ناودا بەبێ یارمەتیدانی ناوگر ئەمانەی خوارەوە دادەرێژرێن:

آ) ئاوەڵناوی لێکدراو:

کون کون، خەت خەت، خاڵ خاڵ، خانە خانە.

ب) ئاوەڵکار

دەستە دەستە، چین چین، سوێ سوێ، چوار چوار و هی دی.

٢ـ لەدووبارەکردنـەوەی نـاو، ئاوەڵنـاو و ژمـارە و بـەهۆی ئـامرازی (بـە) ئاوەڵکـار دادەڕێژرێت:

ڕاست بەراست، زوو بەزوو، دەم بەدەم، ڕۆژ بەڕۆژ، دوو بەدوو و هی دی.

٣ـ لەدووبارەکردنـــەوەی نـــاو و ئاوەڵنـــاودا بەیارمـــەتیی نـــاوگری (ـ او // ـ ەو) ئاوەڵناو و ئاوەڵکار دادەڕێژرێن.

ڕەنگا و ڕەنگ، پێچا و پێـچ، پاشـە و پـاش، ڕاسـتە و ڕاست، دوورا و دوور و هـی دی.

لەنێو وشەی فەرهـەنگی سـلێمانیدا وشـەی دەربـڕاو شـوێنێکی دیـاریکراوی خـۆی هەیە و دەتوانێت دووبارەش بکرێتەوە، لەو کاتەدا دەنگی (ە)ی کۆتایی وشەی دووەمی لەنێو دەچێت. ئەو جیاوازییەی، کە لەم بارەدا دەیبینێت لەگەڵ ئەو وشانەی لەمەوپێش بەوێنـە هێندرانـەوە لـەڕووی مانـەوە و پاراسـتنی واتاکـەی و هـەروا خـاوەنێتی وشـــەی یەکەمی وشە لێکدراوەکەیە، لەدۆخی دووبارەکردنەوەی وشەدا وشـە لێکدراوەکـە هـێز و دەربڕین، کورت کردنەوە وەیا درێژە پێدانی ڕووداوەکە ڕوون دەکاتەوە:

بۆڵە بۆڵ، بارە بار، چزە چـز، سیرەسیر، چۆرەچۆر، کورکـە کورک، قرچـە قـرچ، فیتەفیت، خرەخر، کۆکەکۆك، گڤەگڤ، شڵپەشڵپ و هی دی.

بۆ دەربڕینی پلەی بەهێزی ڕووداو وشەی بێ واتای هور // وور لەگەڵ وشەی یەکەم دا بەکاردێت و وشەی لێکدراو دادەڕێژێت و ئامرازی لێکدەری ـ و ـ ی دەکەوێتە نێوانیان وەك:

گرم و هوور، شڵپ وهوور، زرم و هوور، تریق و وور // هور و هی دی.

### جۆرەکانی وشەی لێکدەری گەیەنەر

وشەی لێکدەری گەیەنەر لەڕووی ئەو بەشـانەی لێـی پێـك هـاتوون و ئـەو هۆیانـەی لێکی داون دابەش دەکرێتە ئەم بەشانەی خوارەوە:

١ـ لێکدانی ناو لەگەڵ ئاوەڵناودا

آ ـ بەبێ هۆی گەیەنەر:

چاوشین ، باڵا بەرز ، دڵ خۆش ، سەرمەس ، زمـان شـیرین ، گـوێ درێـژ ، دەسـت بەتاڵ ، ڕیش سپی ، دەم سارد ، بەخت ڕەش و هی دی.

ب ـ بەهۆی ئامرازی لێکدەر، کە ناوی لێکدراوی لێ دروست دەبێت:

ئـاگرە خۆشـە ، بـاڵا بـەرزە ، بوومەلـەرزە ، باڕەشـە ، مریشـکە ڕەشـە ، بووکـە بەفرینە، ئەسپە دارینە ، بابە گەورە ، سێوە لاسوورە و هی دی.

هـەروەکو وشـە لێکدراوەکـانی ئـەم جـۆرەی لەمەوبـەر بەوێنـە هێندرانـەوە بـەهۆی ناوگری (ـ ە) لێك دراون و هەبوونیشی لەم لێکدانەدا زۆر پێویستە (بڕوانـە لاپـەرە ـ ٥٥) ئـەم نـاوگرە جیـاوازی لەگـەڵ (ـ ی) ئـامرازی خستنەسـەردا هەیـە، کـە هـەمان دەور دەگێرێت (بڕوانە لاپەرە ـ ٤١).

٢ـ ناوی لێکدراو لە لێکدانی ناو لەگەڵ ناودا دادەڕێژرێت:

آ ـ بەبێ هۆی یارمـەتیدەر؛ لـەم بـارەدا لەوانەیـە دیارخـەر یەکـەم وشـە بێـت وەیـا دووەم:

گوڵاو، ئاش وەستا، ئاش خانە، شیربرا، مارماسی، سـێ پـێ، گـوڵ بـەهار، دەسـت نوێژ، ژن برا.

ب ـ بە هۆی یارمەتیدەر:

بەرگەسەرین، بووکە شووشە، دارەهەنار، گوڵەپایزە، کونە لـووت، جەژنـە پـیرۆزە، گوڵە بەهارە، کلکە مشکە، کلاوە ژنۆ.

هەروەکو لەم وشە لێکدراوانەی سەرەوەدا دیارە وشەی دووەمیـان دیارخـەرە نـەك یەکەم.

٣) لە لێکدانی ناو لەگەڵ ئاوەڵناودا ناو و ئاوەڵناو لێکدراو دادەڕێژرێـت (ئـەم جـۆرە وشە لێکدراوانە کەمتر لێك دەدرێن):

آ ـ بەبێ یارمەتیدەر:

ڕەشماڵ، ڕەشاو، سووراو، خۆش باوەڕ، پاك داوێـن، پڕمێشـك، گـەورە مـاڵ و هـی دی.

ب ـ بەهۆی یارمەتیدەرەوە:

پیرەمێرد، شۆرەبێ، کوێرە مار، کورتە باڵا، ڕەشـە دار، ڕەشـەبا (لەگـەڵ وشـەی ـ ڕەشە ـ دا کە لەمەوبەر بەوێنە هێندرایەوە بەراوردی بکە).

**٤ـ لەلێکدانی ناو و ڕەگی کاری ئێستە وەیا رابردوو ناوی لێکدراو دادەرێژرێت هەروا ئاوەڵناویش، بەڵام بەشێوەیەکی کەمتر.**

**آ) بەبێ یارمەتیدەر:**

دەسـاوێژ، هاویشـتن، ماسیگر، دڵخـواز، خواسـتن، ئاشـتی خـواز، ئاسـن ڕفێـن، دەسکەوت، دەسکرد و هی دی.

**ب) بەهۆی یارمەتیدەر ( کەمتر بەکاردێت)، ئاوەڵناوی لێ دادەرێژرێت.**

ئاوەڕێژ، دەسەسڕ، بەردەنووس، سەرەخولێ، چاوەڕوان و هی دی.

**٥ـ لەلێکدانی ناو لەگەڵ ناوی بکەر وەیا کراودا ئاوەڵناوی لێك دراو دادەرێژرێت:**

دڵ ڕەنجاو، دەم دڕاو، سەرمابردوو، دەس قووچاو، ژێر کەوتوو.

**٦ـ لە لێکدانی ژمارە لەگەڵ ناودا ناوی لێکدراو وەیا ئاوەڵنـاوی لێکـدراو رۆدەنرێـت (ئەم جۆرە کەم بەکار دێت).**

یەك ڕەنگ، دوو ڕوو، چوار گۆشە، سێ مانگە، چوارچێوە و هی دی.

پێویستە تێبینی ئەوە بکرێت، کەوا هەر بەو ڕێگەیەدا دەتواندرێت ناوی لێکدراو بەهۆی ناوگری (ـ ە)ش دابرێژرێت.

# جێناو

لەشێوەی سلێمانیدا ئەم جێناوانە هەن: جێناوی کەسی، لکاو، نیشانە، خۆیی، پرس، دیار، نادیار، ناکراو و هەیی.

ئەم جێ ناوانە لەڕووی بەکارهێنانیانەوە دوو جۆرن، جۆری یەکەمیان ئەو جێناوانەن، کە لە بەشی سەرکار (نیهاد) دا بەکاردێن و جۆری دووەمیان لەبەشی وشەیکار (گوزارە) دا، بەڵام هێندێگ ئامراز هەردوو دەور دەگێڕن.

## جێناوی کەسی جودا

| | | |
|---|---|---|
| کەسی یەکەمی تاك و کۆ | من | ئێمە |
| کەسی دووەمی تاك و کۆ | تۆ | ئێوە |
| کەسی سێیەمی تاك و کۆ | ئەو | ئەوان |

جێناوی کەسی جودا لەنێو ڕستەدا دەوری جیا جیا دەگێڕێت:

١ـ لە ئەرکی ڕێزمانی بکەری ڕووداودا جێناوی کەسی جودا لەڕووی کەس و ژمارەوە لەگەڵ کاری بەشی وشەیکار ( گوزارە) دا ڕێك دەکەوێت.

**تۆ بچۆ پارەکە بێنەوە.**

**من هەرگیز ماسی وام نەخواردووە.**

**ئێمە کوردین.**

لەم ئەرکە باسکراوەدا جێناوی کەسی جودا بۆی هەیە لە ڕستەکەدا بەکار نەیەت، وەك:

**خالۆ خەڵکی کام دێی ؟**

**چی ئەڵێن ببین بەدۆستی یەك و هەرگیز جیا نەبینەوە.**

بەکارهێنانی جێناوی کەسی جودا لەم بارانەی خوارەوەدا زۆر پێویستە:

آ- بۆ ڕوون کردنەوەی دوو بیری لێکەوە نـێزیك، (بەتایبـەتی لـەباری لەیـەك چوونـی کەسی دووەم و سێیەمی کۆدا و لەداڕشتنی کاتی ڕانەبوردوودا):

**ئەوان ئێستە ئەڕۆن.**

لەگەڵ (**کەی ئەڕۆن**)دا بەراوردی بکە.

ب - بۆ جیاکردنەوەی کەسی، بەواتا بکەری ڕووداوەکە (لەکاتی قسەی دەربڕاودا):

**من ئەزانم.**

پ - لە ڕستەی ناتەواودا:

**ئەمن بەبێ تۆ، نە تۆ بەبێ من.**

ت - لەبەرامبەری کردن دا:

**ئەوان دەوڵەمەند و من هەژار بووم.**

ج - لە لێکدانیدا لەگەڵ ئامرازی لکاوی (- یش) دا :

**منیش پێم ووت.**

چ - لەبەراوردکردندا:

**بەڕاستی من لەتۆ دڵ گرانترم.**

ح - لە لێکدانیدا لەگەڵ جێناوی خۆییدا:

**من خۆم لەگەڵتا دیم.**

٢- لە ئەرکی بەرکاری ڕاستەوخۆدا (بە دەگمەن بەکاردێت):

**بابێن، ئەو وەختە یان ئەوان من ئەکوژن ، یان من ئەوان ئەکوژم.**

**حەسەن بەگ منی نارد بۆ سەر عەشیرەت.**

٣- لەئەرکی بکەری ڕووداودا لەداڕشتنی لۆگیکیدا:

**من سەرم ێشێ** (بڕوانە بابەتی ڕستەی کاری).

٤ـ لە ئەرکی بەرکاری تیاندا بە گشتی ئەو بەرکارە ناڕاستەوخۆیەی بە یارمەتی ئامرازی پێوەندێوە دارێژراوە:

**خۆت بە خۆت نەبی، کێ بە تۆ ئەبێ.**

**ڕۆیشتنم بۆ شار لەسەر ئێوە وەستاوە.**

٥ـ لەئەرکی دیارخەری (پاشەوە) دا (مەبەستی لەو دیارخەرەیە، کە دوای ناوی دیارخراو هاتووە و بەهۆی ئامرازی خستنە سەرەوە ووشەیەکی لێکدراوی دیارخەریان پێك هێناوە ـ وەرگێڕ).

لەم ئەرکە و لە ئەرکی بەرکاری ڕاستەوخۆدا جێناوی کەسی جودا بۆ جیاکردنەوەی بەشەکانی ڕستە بەکاردێت (ئەم جۆرە داڕشتنە لەژێر کاریگەری کورتکردنەوەی قسەدا دەبێت، بۆیە بەو شێوەیە دادەڕێژرێت):

**باوکی من هاتووە، نەك هی تۆ.**

لەم ڕستەیەی سەرەوەدا ئەرکی جێناوی کەسی جودا و ئەکری بەرکاری ڕاستەوخۆ و تیان بەزۆری دەگونجێت جێناوی کەسی لکاو بێت نەك جێناوی جودا.

لەلێکدانی جێناوی کەسی جودا لەگەڵ جێناوی (هی) زنجیرەیەك جێناوی خۆیی پێك دێت، وەك:

**هی من ، هی تۆ..**

## جێناوی لکاو

جێناوی لکاو، جێناوی لکاوی کەسی دەگرێتەوە هەروا جێناوی (ێ) ش.

جێ ناوی کەسی لکاو[20]

| کەس | تاك | کۆ |
| --- | --- | --- |
| کەسی یەکەم | بزرۆکە و م (م) | مان |
| کەسی دووەم | بزرۆکە و ت (ت) | تان |

| کەسی سێیەم | (ی) بزوێن و (ی) نیمچە یان بزوێن |
|---|---|

لەگەڵ ئەو لێکۆڵینەوانەی، کە دەربارەی جێناوی لکاوی کەسی کراون لە ڕووی تایبەتێتیان لە دیالێکتی کرمانجی خوارووددا تاکە سەرنجێك تێبینی دەکرێت، ئەویش نەبوونی لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆیە سەبارەت بە ئەرکی لە ڕستەدا.

ئەم جێناوی لکاوە بە زۆربەی بەشەکانی ئاخاوتندا دەلکێت (ناو، جێناو، ئاوەڵکار هەروا بە ئامراز و پاشبەندی، لەڕستەدا دەوری بەکار و سەرکار (نیهاد) دەگێڕێت، هەروا ئەرکی جێناوی هەبی و دۆخی تیانی جێناوی کەسی جودا دەبینێت. جێناوی لکاو دەلکێت:

١ـ بەو ناوەی، کە پاشگری پێوە نووساوە (بێجگە لە نیشانە) هەروا لە دۆخی خستنە سەردا جێناوی لکاو بەدیارخەرەوە دەنووسێت[٢١] :

**کوڕم وا نییە.**

**برایە خۆشەویستەکەمان.**

**پایزی ژیانەکەت**[٢٢] .

ب ـ بەکاری تێپەڕ لەکاتی رابوردوودا. دایکم ڕووی گرتمە ناو هەردوو لەپی و پێی ووتم.

جێناوی لکاو لە دەوری بکەری ڕاستەوخۆدا بە کۆتایی کاری تێپەری کاتی ئێستە و داهاتوودا دەلکێت :

**کەس نایان کڕێت.**

**هەڵیان ئەگرێ و ئەیان باتەوە کونەکەی.**

لەم بارەی، کە لەمەوبەر باسکرا جێناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاك هاوبەشی وەیا واتای کۆش دەبەخشێت:

**چەند دانەیەك پێستە ڕێویم پێ بوو ئەمبرد بۆ سابلاخ بیفرۆشم.**

ئەم بارانە لەو کاتانەشــدا ڕوودەدەن، کـە کەسـی سـێیەمی تـاك تێکـەڵ بـەجێناوی نیشانە دەبێت:

**هەمووی چارەکە دینارێکە.**

جێ ناوی لکاو لەدەوری بکەری تیاندا بە ئەمانەی خوارەوە دەلکێت:

آ ـ بەو کارەی تێپەڕە و لە کاتی ئێستە و داهاتوو دایە:

**ئەگەر بووت بمدەوە.**

ب ـ بە بەرکاری ڕاستەوخۆدا:

**کتێبەکەم بدەرێ.**

جێنـاوی لکـاو، کـە لەگـەڵ بـەرکاری تیـان دا دەبێـت بـەهۆی ئـامرازی پێوەندێـوە شوێنی بەم جۆرەی خوارەوە دەبێت:

آ ـ بە ئامرازی پێوەندێوە دەلکێت:

**چەند بۆت گریام.**

ب ـ بـە بـەرکاری ڕاسـتەوخۆوە دەنووسـێت لـەو بـارەی، کـە ئـامرازی پێوەنـدی دەکەوێتە دوای بەرکارەوە:

**ئەمەوێ کۆشکێکم بۆ دروست بکات.**

کە جێناوی لکاو دەوری بکـەر دەگێڕێت دەکەوێتـە پێـش وەیـا پـاش بەرکارەکە، بەڵام کە جێ ناوی لکاو دەکەوێتە کۆتاییەوە باری (کەس) بکەر ڕوون دەکاتەوە، وەك:

**سەرم ئێشێ.**

**بەڵێ دوو شاهێدم هەیە.**

لەکاتی لکانی جێناوی لکاودا بە پێش کارەوە بـاری نـاکراو پێکدەهێنێـت و لەگـەڵ کاری هەمە، هەتە و دەبێتە نیمە، نیتە.

جێناوی لکاو لەگەڵ کاری لێکدراوی کاری ـ ناویدا دەکەوێتە نێوان هەردوویانەوە:

برسیمە

برسیتە

ئەم دوو کارە سادانەی پێشوو لەگەڵ ئەم دوو کارە لێکدراوانەی داهاتوودا بەراورد بکە:

برسیم نییە.

برسیت نییە.

جێناوی لکاو لەگەڵ کاری رابردووی تێپەڕدا کەس و ژمارە دەست نیشان دەکات لەم بارەدا جێناوی لکاو لەنێو ڕستەدا چەند جۆرە ئەرکی ڕێزمانی دەگێڕێت: ماڵەکەیان پڕێتی لە میوانان.

جێناوی لکاو لە سینتاکس دا دەوری بەشەکانی ناسەرەکی وەك بەرکاری راستەوخۆو تیان و دیارخەر لە رستەدا دەگێرێت. (بڕوانە بەشی سینتاکس).

## جێناوی بێکەسی (ـ ێ)

لەشێوەی سلێمانیدا جێناوی لکاوی ( ـ ێ) لەم بارانەی خوارەوەدا بەکاردێت:

١ـ بەلێکدانی لەگەڵ ئامرازی پێوەندی سادەدا ئامرازی پێوەندی ناسادە دروست دەکات و لە شێوەی (لێ، پێ، تێ)دا دەبێت و بەزۆری لە رستەدا بەکاردێت.

٢ـ لەگەڵ کاری (دان) و (گەیشتن) بەکاردێت.

جێناوی لکاوی ( ـ ێ) چۆن لەگەڵ ئامرازی پێوەندیدا بەکاردێت، ئاواش لەگەڵ کاردا بەرچاو دەکەوێت و بە کۆتایی کارەوە دەلکێت و بەرکاری تیان پێشان دەدات، کە بریتی دەبێت لە جێناوی لکاوی کەسی وەیا کۆتایی کەسی:

**لێیان چوومە پێشەوە.**

**کتێبەکەت ئەدەمێ.**

**پێی ووتن.**

**پیاوەکە لە خۆشیان بەخششێکی زۆری دانێ.**

جێناوی لکاوی کەسی وەیا کۆتایی کەس کار پێویستە وەکو بەرکاری ناراستەوخۆ (تیان) لێکبدرێتەوە، کە باری تێپەری کار پێشان دەدات و دەچێتەوە سەر شێوەی کاری رابوردووی تێپەڕ و وەکو بەرکارێکی تیان دەور دەگێرێت هەروەکو چۆن کۆتایی کەسی کار لەگەڵ کاری رابوردووی تێپەڕدا هەر ئەو رۆڵە دەبینێت لە پێشان دانی کەس و ژمارەی بکەری ڕوودادوا، ئەم جێناوەش هەر ئەو ئەرکەی لەگەڵ کاری تێپەڕی رابوردوودا هەیە [٢٣].

بەم جۆرە جێناوی لکاوی ( ـ ێ) دەوری خاوەنیەتی جێناوی کەسی لەدەست داوە و ئەرکی سەرەکی لە مۆرفۆلۆژیدا وەکو نیشانەیەك بەرچاودەکەوێت، کە هێمایەکە بۆ ناراستەوخۆیی بەرکار لەنێو ئەو رستەیەدا، کە کراوەکەی برێتی دەبێت لە جێناوی لکاو وەیا کۆتایی کەسی کار[٢٤].

## جێناوی نیشانە

جێناوی نیشانە سێ جووتە جێناوی دژ واتا دەگرێتەوە:

ئەم. ئەو

ئەمە. ئەوە

ئەمان (ە). ئەوان (ە)[٢٥].

جێناوی ***ئەم، ئەو*** ئەرکی دیارخەر دەگێرن، لەم بارەدا دەکەونە پێش ئەو ناوەی لەگەڵیدا بەکارهاتوون. ناوەکەش هەمیشە کۆتایی بە نیشانەی ناسیاری (ـ ە) دێت (بڕوانە بابەتی نیشانەی ناسیاری و نیشانەی نەناسیاری) وێنە:

**تەنها من و ئەم ساوایە ماینەوە.**

**بەو[٢٦] قسانە ئەیویست دڵخۆشی خۆی بداتەوە قومێك لەو دەرمانەش بخواتەوە.**

لەوانەیە هێندێك جار دیارخەری چەندی بکەوێتە نێوان جێناوی نیشانە و ناوی

دیارخەراوەوە، دیارخەرە چەندێکەش بۆی هەیە بریتی بێت لە (ژمارە و جێناو):

**ئەم سێ کتێبەش هی منە.**

**ئەم پارچە زەوییە من ئەناسێت.**

**ئەم هەموو دۆس و برادەرەت لە کوێوە پێکەوەناوە.**

لەکاتی بەکارهاتنی جێناوی نیشانە لە دەوری دیارخەردا (بە شێوەیەکی گشتی جێناوی *ئەو* ئەم دەورە دەگێڕێت):

**کابرایێک ماڵ و سامانێکی زۆری هەبوو، لەگەڵ ئەم سامانەیە تاقە کوڕێکی هەبوو، بە هەموو جۆرە نازدارییەك ئەم کوڕەی بەخێو ئەکرد.**

**ئەمە راستە، بەڵام نەئەبوو ئەم شیوەنە بۆ ئەو کۆرپەیە لێرە بگێڕێت.**

**بەم ڕەنگە ئەو خێزانە ئەو ڕۆژەیان بەخۆی لە چوار باخ بەسەربرد.**

کە ئەم جێناوانەی نیشانەی دەوری بەشەکانی ڕستە دەگێڕن هاوبەشی دەوری ناوی کەسی دەکەن:

**نزای بۆ یەزدان ئەکرد یەکێك لە یاریکەرەکان شتێکی لێ بقەومێنێت هەتا ئەم بانگ بکەن.**

**باوکە لەدوای ماوەیەك تێپەڕبوون بەسەر نەگەرانەوەی دایکەدا دڵنیابوو، کە ئەمیش چووە پاڵ ئەوان.**

جێناوی نیشانەی *ئەم* کە بۆ شوێنی نێزیك بەکاردێت، بەشێوەیەکی گشتی دەوری بەشەکانی سەرەکی رستە دەگێڕێت، بەڵام جێناوی نیشانەی شوێنی وەیا کەسی دوور بە شێوەیەکی گشتی بۆ بەرامبەری کردن بەکاردێت:

**گرەو ئەکەن لەسەر هەندێ پارە، ئەگەر ئەم ئەوی هێنایە پێکەنین ئەوەندە پارەی بداتێ، ئەگەر خۆ واش نەبوو ئەم دوو ئەوەندە پارە بدا بەو.**

**ڕەنگە ئەم دووانە لەم دەوڵەمەندتر بن.**

**بەم جۆرە ئەم پرسیاری ئەکرد و ئەویش وەڵامی ئەدایەوە.**

جێناوی نیشانەی ***ئەم و ئەو*** لەم ڕستەیەی خوارەوەدا تێبینی بکە، کە بۆ بەخشینی واتای یەك کەس وەیا کەسێکی دی بەکارهاتووە. لەگەڵ ئەوەشا ئارەقی خۆی لە بەیانیەوە ئەفرۆشیت ئەم و ئەویش لە مەیخانەکەی بە سەرخۆشی ئەهاتنە دەرەوە.

**لەم و لەو ئەپاڕانەوە.**

کە جێناوی نیشانەی (ئەو) دەوری سەرەکی رستە دەگێرێت لەباری خستنەسەردا دەبێت لەگەڵ دیارخەردا، کە برێتی دەبێت لە (کە) وەیا (تر) و جێناوی لکاوی کەسی سێیەمی کۆیان (یان) پێوە لکاو بێت.

دەستەجلیش بۆ تۆ ئەکرم، بەڵکو دووان، تا کە یەکێکیانت شت ئەوی تریان لەبەر بکەیت.

جێناوی نیشانەی (ئەمە) و (ئەوە) تەنیا دەوری بەشەکانی سەرەکی رستە دەگێرن.

أ) کەس وەیا شتی باسکراو دەست نیشان دەکات.

**ئەمە کێیە ؟ ئەمە شاری سلێمانییە.**

**ئەوە دەنگی دەرگایە.**

بۆ بەرامبەریکردنی ئەم جێناوانەی نیشانە جێناوی لکاو کەسی سێیەمی کۆیان پێوە دەلکێت.

**ئەوا ئەوەیان پزیشکە، ئەوی تریان گۆڕ هەڵکەنە.**

ب ـ تێکەڵبوون لەگەڵ ئەو ناوانەی واتای شت (کەس بەشێوەیەکی کەمتر) دەبەخشن.

**بەڵام ئاخر ئەوەشم لەدەس دەرنەچێ، ئیتر چیم بۆ نەمێنێتەوە.**

**مێردەکەی کە ئەمە ئەڵێ ژنەکە ئەزانی، کە ئەوە شێرەکە بوو.**

**ئەمە بەرە ئەوە بەجێ بهێڵە.**

جێناوی نیشانەی (ئەوە) لە جۆری دەربڕیندا بۆ پتەوکردن واتای جێنـاوی پـرس دا بەکاردێت.

**ئەوە چۆن وات لیٚ هات؟**

**دایە ئەوە بۆ کویٚ ئەچی؟**

جێناوی نیشانەی ئەمە، ئەوە لەباری کۆدا شێوەی ئەمانە و ئەوانەیان دەبێـت، کـە لە ڕووی بەکارهاتنەوە زۆر لێکدەچن وبۆ گیانداران و بێگیانان بەکاردێن.

**ئەمانە هەموو دۆس و برادەری منن.**

**ئەمانەی لە دەفتەردا نووسی و ووتی..**

**دەبچۆ سەبەتەیەك کاشم بۆ بهێنە. ئەو ڕەشمەیەش بهێنە ئەمانەت بۆ چییە ؟**

**کوڕم ئەو سوارانە باوك و براکەت بوون.**

**چۆن ئەوانە باو و برای من بوون؟!**

## جێناوی خۆیی

جێناوی خۆ شـێوەی کـەس و ژمارەشـی نییـە و لەگـەڵ جێنـاوی لکـاوی کەسـی دا لێکدەدات، جا بە کاردێت:

خۆم، خۆت، خۆی

خۆمان، خۆتان، خۆیان.

دەوری بەشەکانی سەرەکی و ناسەرەکی ڕستە دەگێڕێت:

**خۆم لەسەر منارەکە پاڵم پێوەنا.**

**ئێستا بەو پارانە کۆشك و سەرایەکی بۆ خۆی دروستکردووە.**

**بابە ئێمە خوشکی خۆمان نادەین، تۆ کەیفی خۆتە.**

**وازم لیٚ بێنە با بڕۆم لەڕێی خۆمەوە.**

جێناوی خۆ لەگەڵ کاردا بەکاردێت و واتای خۆکردن دەگەیەنێت.

خۆکوشتن، خۆشاردنەوە، هاتنە سەرخۆ. خۆ بێ گوناه زانین و هی دی.

## جێناوی پرسکردن

١) جێناوی کێ و چی دەوری بەشەکانی سەرەکی ڕستە دەگێڕن:

**کێ کردی و کێ بردی.**

**نازانم چی لێ بەسەرهات.**

**ئەمە کێیە ؟**

**نەشی ئەزانی بیر لەچی بکاتەوە.**

ب) دەوری وشەیکار ( گوزارە) دەگێڕن: **چای چی؟**

واتای خاوەنیەتی دەبەخشێت، کە لەگەڵ جێناوی هین دا بەکاردێت:

**هی کێ، هی چی**

**ئەم خانووە هی کێیە ؟**

جێناوی پرسی چی شێوەی چ شی هەیە، کە هەر لەوەوە وەرگیراوە، بەڵام لەرووی بەکارهاتنەوە دەوری دیارخەر دەگێڕێت و دەکەوێتە پێش ناوی دیارخراوەوە، کە هەمیشە نیشانەی نەناسیاری (ـ ێك)ی پێوە دەلکێت:

**لە چ ڕۆژێکا جەژنی نەورۆز ئەکرێ؟**

**ئەمە چ وەختێکە ؟**

**تۆ لە چ بنەماڵەیەکیت ؟**

جێناوی پرسی چ واتای پرسکردنی خۆی لەدەست دەدات، کەبارێکی کاریگەر دەخاتە ڕوو:

**نازانی چ دەردێکم کێشاوە ساڵی ئەمساڵ.**

**تەماشا چ هێلانەیەکی نەرم و نۆڵم بۆ دروست کردبووی !**

**لە ترسا گۆرانیم ئەووت، بەڵام چ گۆرانی !**

لەگەڵ ئەو کارەی لەشێوەی ناکراو دایە، جێناوی پرس واتای هیچ دەبەخشێت:

**باوکە گییان ئێمەش چمان ناوێت.**

**بۆ ئەوەی چ کەم و کورییێکم لیٚ بەدی نەکەن.**

جێناوی ***کام***، ***کامە*** شـێوەی کۆییـان (کامـان) و (کامانـە)یـە. (کـە جێنـاوی لکـاوی کەسی دووەم و سێیەمی کۆیان پێوەدەلکێت).

أ) دەوری دیارخەری پێش ناوی دیارخراو دەگێڕن.

ب) دەوری وشەیکار (گوزارە) دەگێڕن.

جێناوی ***کام***، کە دەوری دیارخەری پێش ناوی دیارخراوەوە دەگێڕێت هێندێك جـار ناوی دیارخەر بزوێنی (ـ ە)ی دەچێتەسەر:

**کام وشەیە ؟**

**کام شێت بەبێ پارە سوارم ئەکا ؟**

**کام ئەسپیان سواری بم ؟**

جێناوی کامە بەزۆری دەوری وشەیکار (گوزارە) دەگێڕێت:

**ئەی کراست کامەیە ؟**

**کامانەن ؟ ئا ئەوانەن**

جێناوی ***چۆن***، ***چلۆن*** پرسیار لە چۆنیەتی شت دەکەن:

**حاڵ و ئەحواڵت چۆنە ؟**

**چلۆن پیاوێکە ؟**

**ئەی ئەمە چۆن بزانم ؟**

**ئەیکات ـ چلۆن ؟**

جێناوی **چەن** (د) چەندێ لەم بارانەی خوارەوەدا بەکاردێت:

آ) وەکو جێناوی پرسیار:

**چەند قوتابی و چەند مامۆستا لەم قوتابخانەیەدا هەیە ؟**

لەکاتی بەکارهێنانی ناوی دیاخراو و جێناوی چەند لەشێوەی چەندێ دا دەبێت.

**مەلا چەندێ بەست ئەکا ؟**

ب) ئەو ناوی دیارخراوەی، کە لەگەڵ جێناوی چەندی بەکاردێت وەکو جێناوی نادیار نیشانەی نەناسیاری ( ـ ێك)ی پێوە دەلکێت:

**چەن مانگێ تێ ئەپەرێ.**

**چەند کەسێ پێکەوە دانیشتبوون.**

**چەند خۆشە دنیا.**

**چاو و برۆی چەند رەشبوو.**

## جێناوی دیار

جێناوی (هەموو، هەر، کەی، تر، دی، دیکە، وا، وەها، ئەوتۆ، فلانە) بەر جێناوی دیار دەکەون.

جێناوی هەموو هەر دەوری بەشەکانی سەرەکیی رستە دەگێرن و دەکەونە پێش ناوی دیارخراوەوە:

**هەموو دانیشتوانی گوندەکە فرمێسکیان ئەباراند ڕەشکۆ و کورەکەی نەبێ.**

**هەموو ئەستێرەژمێری مەملەکەتی کۆکردەوە.**

دارشتنی دیارخەر لەگەڵ جێناوی هەمووداجێناوی نیشانە دەر دەخات لەو کاتەدا ناوی دیارخراو (ە)ی پێوە دەلکێت، کە بە پاشگرێکی ناسیاری و دیارخەری ناسراوە.

**ئەم هەموو شتوومەکە جووانە، ئەم هەموو ئاڵتوونە لەکوێوە هێنراوە؟**

**کابرا، کە گەیشتە کانییەکە دی ئەو هەموو خەڵکە بەسەر منداڵەکانیدا داباریوە.**

کە نیشانەی نەناسیاری بە کۆتایی ناوی دیارخراوەوە و دەلکێت هەموو واتای هەر دەبەخشێت:

**هەموو رۆژێ، هەموو داناو و زانای مەملەکەتی کۆئەکردەوە.**

**هەموو کەس گۆشت خۆرە، هەر ناوی گورگ بەدناوە (پەند).**

**بەچکەی هەموو گیانلەبەرێك جووانە.**

ئەم رستانەی لەمەوبەر لەگەڵ ئەم رستانەی ژێروو بەراوردبکە، کە نیشانەی نەناسیاری ـ ێك لەگەڵ ناوی دیارخراودا بەکارنەهاتووە.

**هەموو رۆژ منالێکی ئاوا دە ساڵانەم ئەدی.**

**هەموو جار خۆی ئەدزێتەوە.**

**هەموو کەس نانی خۆش ئەوێ، بەڵام وەك شوان نایگرێ بەسەر دڵیەوە.**

جێناوی هەموو کە وەکو ناو دەوری سەرکار (نیهاد)ی رستە دەگێرێت جێناوی لکاوی کەسی سێیەمی کۆی پێوە دەلکێت، کە واتای تێکرایی گیاندارانی بە شێوەیەکی

کۆمەڵ گەیاندووە:

**هەموویان قسەیان هاتە سەر ئەوە، کە ئەم کوڕە لەگەڵ بەسێدا بڕوا.**

**هەموویان هەستان.**

ئەم ڕستانەی پێشوو لەگەڵ ئەم ڕستانەی خوارەوەدا بەراورد بکە، کە جێنـاوی لکـاو بە کۆتایی هەمووەوە نەلکاوە:

**هەموو لەوەرام دا ئەڵێن.**

**هەموو قاپییان داخست.**

**گوایە هەمووی هی خۆی نییە.**

**هەمووی چارەکە دینارێکە.**

جێنـاوی **هـەر** دەوری دیارخـەری دەگێڕێت و دەکەوێتـە پێـش نـاوەوە. ناوەکـەش کۆتایی بەنیشانەی نەناسیاری هاتووە.

**هەر هەوارێك نشیوێکی هەیە. (پەند)**

**کابرای دز ئەچووە هەر ژوورێ، هەر سندووقێ، هەر پریاسکەیەك، هەر بوخچەیـەکی ئەکردەوە.**

جێناوی هەر لە دەوری ئاوەڵوشەیکار (ئاوەڵگوزارە) یشدا بەکاردێت:

**من نەك هەر دڵم بەڵکو هەموو ئەندامی لەشم لێ ئەدا.**

**هەردوو منداڵەکەش هەر بە خەڵکەکەیانا هەڵئـەڕوانی نـەیان ئـەزانی ئـەم خەڵکـە بۆ کۆبوونەتەوە.**

**گومان نی‌یە هەر دێت.**

**بڕیارم دا هەر ئەو شەوە هەمووی بەجێ بهێنم.**

جێنـاوی **هـەر**[٢٧] (یەکـە)ی دەچێتـە سـەر و دەوری سـەرکار (نیـهاد) ی ـ نـاوی دەگێڕێت:

**هەریەکە توێشووی خۆی خستبووە ناو دەسەسرێکی سوورەوە و لاپشتی بەستبوو.**

**قسەیان کرد بەیەك کە هەریەکەیان بچنەوە ماڵی باوکیان.**

جێنـاوی دیـاری کـە (ی)، دی (کـە)، تـر ، وا، وەهـا، ئـەوتۆ، کـە دەوری دیارخـەر دەگێڕێت دەکەوێتە دوای ناوی دیارخراوەوە:

**لە قاقەزی شڕ زیاتر هیچی کەی نەدیوە.**

**مزگەوتوکە هەر ئەبینێ، جارێکی تر.**

**ڕۆژی واش هەبوو.**

**دەمێك بوو زەردەخەنەی وەهای نەدیبوو.**

وا، وەها لەدەوری ئاوەڵوشەیکار (ئاوەڵگوزارە) ش بەکاردێت:

**ئێوە چۆن بڵێن من وەها ئەکەم.**

**بۆچی وا داماوی ؟**

**هیچ شتێکی ئەوتۆ نازانین.**

جێناوی دیاری (فلانە) دەوری دیارخەری پێشەوە دەگێڕێت:

**شێرۆ لەدەمەدەمی ئێوارەدا لەفلانە ئەشکەوت خەزنەیەکی ئاڵتوونم دەست کەوت.**

## جێناوی نادیار

ئەم جێناوانەی خوارەوە بەر جێناوی نادیار دەکەون:

١- لە لێکدانی وشەی ***کەس، شت، یەك*** لەگەڵ نیشانەی نەناسیاریدا جێنـاوی نادیـار دادەڕێژێت.

کەسێ (ك)، شتێ (ك)، یەکێ (ك).

**جا لەبەر ئەوە لەپێش ئەوەدا، کە شـتێکیان بـۆ بگێڕمـەوە ئـەبێ تەماشـایەکی نـاو ئاشەکە بکەین.**

**کەسێ هاتووە ؟**

**ئەگەر یەکێ ویستی بڕوا**

٢ـ لێکدانی جێناوی **هەر** ی نادیار لەگەڵ :

أ ) جێناوی نادیار:

**هەرکەسێك، هەرشتێك.**

**هەرکەسێك چاڵ بۆ یەکێ هەڵکەنێ، خۆی تێی ئەکەوێ (پەند).**

**هەر شتێك لە ژوورەکەدا بووایە کۆم ئەکردەوە.**

ب) جێناوی پرس : *چ ، چی، کام، چۆن، چەند*:

**هەرچی هەیە بۆم تێ بکە.**

**بۆ هەر چ لا برۆشتایە.**

**هەر چۆن خانوویێ بێ.**

**هەرچەند ئەبەی ببە.**

هەروەها جێناوی هەندێ ـ هەنێ بەر جێناوی نادیار دەکەوێت و دەوری دیارخەروەیا ئاوەڵوشەیکار (ئاوەلگوزارە) دەگێرێت:

**هەندێك (یان) ئەڵێن.**

**ئیمساڵ منالەکان ئەچنە قوتابخانە، هەندێکیان ئەچنە سەرەتایی، هەندێکیشیان ئەچنە ناوەندی.**

## جێناوی نای (هیچ)

جێناوی هیچ لە رستەی ناکراودا بەکاردێت و دەوری سەرکار (نیهاد) و دیارخەر دەگێرێت. جێناوی هیچ لەدەوری ناودا جێناوی لکاوی کەسی سێیەمی کۆی پێوەدەلکێت:

**ئەوە چی ئەکەی لەوێ ؟ هیچ.**

**من ئێستا هیچم نەکریوە.**

**هیچم بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێ بڵێم.**

**بەڵام هیچیان نەیتوانی دەری بهێنن.**

لە لێکدانیدا لەگەڵ جێناوی نادیاری کەس (ـ ێك)، شتێك دا واتای هیچ کەس و هیچ شت دەگەیەنێت.

**هیچ کەس ناتوانێ ئەمە بکا.**

**هەوڵی ئەدا بیر لەهیچ شتێك نەکاتەوە.**

جێناوی هیچ لە دەوری ناوی‌دا نیشانەی (ـ تر)، کەی، وای دەچێتە سەر.

***لەوە زیاتر هیچی تری بۆ بەجێنەهێشتم.***

**هیچی وامان نی‌یە بۆ شام.**

**هیچی کەی دەستنەکەوت**

لەدەوری دیارخەردا جێناوی هیچ دەکەوێتە پێش ناوی دیارخراوەوە، کە ناوە دیارخراوەکەش نیشانەی نەناسیاری پێوە دەلکێت:

**بریاری دا سەر لەهیچ ماڵێکا نەکا.**

**هیچ چارەییێك نییە.**

جێناوی هیچ لەهەمان رۆڵ دا هێندێك جار بە پاش ناوەوە دەکەوێت:

**پیاوێکی هیچ**

**تاقەتی هیچی نەبوو.**

هێندێك جاریش دەوری ئاوەڵوشەیکار ( ئاوەڵگوزارە) دەگێرێت:

**کوڕەکەش هیچ خۆی تێك نەدا.**

**ئەم پیاوە هیچ لەمن قورستر نی‌یە.**

## جێناوی هی

جێناوی نسبی هی لەم بارانەی خوارەوەدا بەکاردێت:

١ـ لەگەڵ ئەم ناوانەی داهاتووی ژێرەوە، وەیا لەگەڵ ئەو جێناوانەی وەك ناون و وشەیەکی لێکدراو دادەرێژن و واتای خاوەنێتی دەبەخشن:

**دە باشە ئافرەت پێم نالێین ئەم زەوییەی من لە پێشا هی کێ بووە ؟ هی باپیرانی تۆ، یان هی باپیرانی ئاغا بووە؟**

**بەئەقڵی من هی کەسیان نەبووە.**

**هی خۆم بۆ خۆم هی تۆ ئەخۆم (پەند).**

٢ـ بەلێکدانی لەگەڵ ئاوەڵناو وەیا جێ ناوی دیاردا دەوری بەشی سەرکار (نیهاد) ی ـ ناوی دەگێرێت:

**هی بچووك لە هی گەورە جووانترە.**

**تۆ هی ترت دەست ئەکەوێ.**

٣ـ دەوری هاوبەشی جۆراوجۆر دەگێرێت:

***گۆشتی کەڵەشێر ناخوات، هەر هی مریشك. کە بووك ئەگوێزنەوە سواری مایینی ئەکەن هی ئەسپی ناکەن.***

**دیوەخانێکی جوانی گەورە لەهی ماڵە گەورە جوانتر و خۆشتر بوو.**

# ژماره

## ژمارەی چەندی

ژمارەی چەندی لەڕووی دارشتنەوە؛ سادە و نەسادە:

سادە ، کە ژمارە تاکەکان دەگرێتەوە:

یەك، دوو، سێ، چوار، پێنج، شەش، حەوت، هەشت، نۆ.

ژمارە دەیەکان:

دە (هـ)، بیست، سی، چل، پەنجا، شەست، حەفتا، هەشتا، نەوەد، هەروا ژمارەی سەد، هەزار، ملیون // ملیۆن.

ژمارەی نەسادە لەژمارەی یازدە // پانزەوە دەگرێتەوە تا نۆزدە هەروا لە ژمارە دوو سەدەوە تا نۆسەد. ئەم ژمارانە لەدوو بەش پێك هاتوون، کە یەك دانە ووشەیان لەڕووی ماناوە لێ دروست بووە. لەم بارانەدا یەکەم ووشە برێتیە لەژمارەی یەکانە، ووسەی دووەم (دە)ی چۆتە سەر، وەك:

یانزە // یانزدە، دوانزە // دوانزدە، سیانزە // سیانزدە، چواردە، پانزە // پانزدە، شانزە // شانزدە، حەڤدە // حەڤە، هەژدە، نۆزدە،

وەیا:

سەد: دووسەد ، سێ سەد، چوارسەد، پێنج سەد، شەش سەد، حەوسەد، هەش سەد، نۆسەد.

ژمارەی لێکدەر ئەو ژمارانە دەگرێتەوە کە لە چەند ژمارەیەك پێك هاتوون بە یارمەتی ئامرازی - و -:

بیست و یەك، سەد و چل، هەزار و پێنج سەد ، سێ و هتد.

بەشێوەیەکی گشتی ژمارە کە لەگەڵ ناوی ژمێردراو هات، دەکەوێتە پێشێوە،

ناوەکە لەباری تاکدا دەبێت (زۆر بەکەمی لەباری کۆدا ) تەنیا ژمارەیەک نەبێت لەشێوەی (ێك)دا بەدی دەکرێت و وەکو پاشگرێك بەناوی ژمێردراوەوە دەلکێت:

**لەهەشتا ساڵ تێپەڕیوە.**

ئەم ڕستەیەی پێشوو لەگەڵ ڕستەی داهاتوودا بەراورد بکە، کە ناوی ژمێردراوی تێدا لە باری کۆدایە.

**ئەوسا لە سی ساڵان تێنەپەڕیبوو.**

**سێ گوڵ لە باخەکەتا هەیە.**

**سەد کەس بە ڕەحەتی لەسەری جێی ئەبێتەوە.**

**چەپڵە بە دەستێك لێ نادرێت.**

ناوی ژمێردراو نیشانەی ناسیاری هێندێك جار بەکۆتاییەوە دەلکێت:

**دوو زەلامە هاتە پێشەوە.**

**لە دوای پێنج ڕۆژەکە.**

**ئەم چوار کوڕە پەلاماری باوکیان دا.**

ئەگەر نیشانەی نەناسیاری بەکۆتایی ناوی ژمێردراوەوە لکا، ئەوە دەگەیەنێت کەوا نێزیکی ئەو ژمارەیەیە، کە باسکراوە:

**چوارسەد سوارێك چوون.**

**لە دە هەنگاوێك لێی دوور بووین.**

**من عەمرم سی و پێنج سالێك ئەبوو.**

لەم بارەی لە سەرەوە باسکراودا هێندێك جار وشەی ئاوەڵکاری وەك نزیك (ە)، هەتا بۆ ئەو واتایە بەکار دێن:

**عەزیز ئاغا نزیکی سەد سالێك عومری هەبوو.**

**نزیکەی سێ هەزار دینارێك.**

**هەتا دە سالێکە.**

ژمارەی چەندی، کە دەوری بەشەکانی سەرەکیی ڕستە دەگێڕێت نیشانەی ناسیاری و نیشانەی کۆی پێوە دەلکێت:

**شلەشاری راستەقینە ئەم دوو وانەن.**

**ئەم رستەیەی پێشوو لەگەڵ ئەم داڕشتنەی داهاتوو بەراورد بکە:**

**ئەم دوو شلەشارییە.**

**سێیانەکەی تریان.**

دەبێت تێبینی ئەوە بکرێت، کەوا لەکاتی باسنەکردنی ناوی ژمێردراودا، ژمارە جێگەی ئەو دەگرێتەوە:

**کوڕەکە عەمری گەیشتە سیانزە بۆ چواردە ئەچێ.**

ژمارەی یەك ، کە دەوری بەشەکانی سەرەکی رستە دەگێڕێت، هەمیشە نیشانەی نەناسیاری پێوە دەلکێت:

**یەکێکیان تەنها کوڕێکی مابوو.**

**یەکێ لەم سێ کەسەت پێ ئەبەخشم.**

**یەکێ ئەیووت تەنها دوو دەقیقە بوو، یەکێك ئەیووت پێنج دەقیقە بوو.**

ژمارەی چەندی لە لێکدانیدا لەگەڵ جێناوی دیاری هەر واتای کۆ وەیا هەمووی - گشتی دەگەیەنێت، هەر سێ، هەرچوار و هی دی:

**هەردوو خوشکە ئەکەونە خۆ کوشتن و گریان.**

**هەر سێ پلەکانم تاقی کردەوە.**

لەگەڵ ئەم ڕستەیەی خوارەوە بەراوردی بکە:

**(هەرسێ ماڵەی تفەنگێکی بەر ئەکەوێ).**

لەم رستەیەی پێشوودا هەرسێ واتای هەموو وەیا گشت ناگەیەنێت.

کە ژمارەی چەندی لەگەڵ چەندان (ە)دا لێك دەدات واتای کۆ دەبەخشێت:

دوو چەندان، دوو چەندانە.

دووپاتکردنەوەی ژمارەی چەندی واتای دابەش دەبەخشێت:

یەك ـ یەك ، دوو ـ دوو، سێ ـ سێ و هتد.

ژمارەی دابەش بەهۆی ئامرازی پێوەندی ( بە)ش دادەرێژرێت. کە دەکەوێتە نێوان ژمارە دووپات کراوەکەوە:

یەك بە یەك، دوو بەدوو وهتد.

ژمارەی کەرتی لە لێکدانی دوو ژمارەی چەندی دادەرێژرێت، ژمارەی یەکەمی ژمارە بناخەکەیە و لێ وەرگیراوەیە، ژمارەی دووەمی وەرگیراوەکەیە:

سێ یەك، دوو یەك

هێندێك جار وشەی تەقسیم هاوبەشی ئەم جۆرە ژمارەیە دەکات .

دوو تەقسیمی سێ.

هەروا ناوی نیو // نیم، چارەك // چارەك بۆ دارشتنی ژمارەی کەرتی بەکاردێت:

**بە چارەك سەئاتێك.**

**سەئات چارەکەکی ئەوێت بۆ یانزە.**

بۆ دارشتنی ژمارەی رێژەیی ووشەی (سەد) بە یارمەتی ئامرازی پێوەندی (لە) کە دەکەوێتە پێشیۆە دادەرێژێت:

لەسەدا یەك.

سەدی دە.

سەدی پێنج و هی دی.

## ژمارەی پلەیی

ئەم جۆرە ژمارەیە بە یارمەتی پاشگری (ـ م) وەیا (ـ ەمین)، کە بە کۆتایی ژمارەکەوە دەلکێت جا ژمارەکە چ سادەبێت، چ لێکدراو:

یەکەم (ـ ین)، دووەم (ین) // دووهەم (ین)

سێیەم (ین) // سێهەم (ین)، دەیەم (ین) //، دەهەم (ین)، یانزەم (ین) // یانزەهەم (ین)، چلەم (ین) // چل هەم (ین)، سەدەم (ـ ین) و هتد.

ئەو ژمارانەی، بەیارمەتی پاشگری (ـ ەم) دادەرێژرێن بۆیان هەیە ببنە بەشێك لە وشەیکار ( گوزارە) هەروەها بەشێك لە سەرکار ( نیهاد) :

**دەرسی یەکەم.**

**یەکەم کەنیزە بوو.**

**سێهەمیان ووتی..**

هەروا ئەو ژمارانەی بەیارمەتی پاشگری (ـ ەمین) دادەرێژرێن دەکەونە پێش وەیا پاش ناوەوە:

**سالّی حەوتەمین:.**

**یەکەمین جار.**

کە ئەم جۆرە ژمارەیە دەکەوێتە دوای ناوی ژمێردراوەوە، بە یارمەتی ئامرازی (ـ ی) خستنە سەرەوە بە یەکەوە دەبەسترێن، ئەم دوو دارشتنانەی خوارەوە بەرا وردبکە:

**(بۆ دووەم جار، نەك بۆ جاری یەکەم)**

هێندێك جار ئەم وشانەی خوارەوە دەکەونە نێوان ژمارە و ناوی ژمێردراوەوە:

١ـ ناوی ژمارە: وەك أ) (سەر): پێنج سەر خێزان، دە سەر مەڕ.

(سەر) بۆ ژماردنی خەلك و گیانلەبەرانی دی بەکاردێن.

ب) (دانە)، )، (دەنکە)، بۆ ژماردنی شتی وورد بەکاردێت:

**دوو دەنکە شقارتە.**

**دوو دانە فرمێسك.**

پ) دەستە:

**سێ دەستە جل.**

**دەستەیە پیاڵە.**

**دەستە گوڵ.**

ت) کۆمەڵە:

**سێ کۆمەڵە گەنم.**

ج) ڕانە:

**دوو ڕانە مەڕ.**

چ) ڕەوە، ڕەفە، باقە، چنگ، مشت، پارچە، لەتە، کەرتە، قاشە و هی دی.

٢ـ وشەی کەرەستەی پێشان دەر:

گۆزە (لە)، کووپە، جامە، شووشە، تەنەکە، تەغارە:

**سێ کووپە ڕۆن.**

**دوو گۆزە ئاو.**

٣ـ ناوی کێش و پێوان:

**سێ مەن ڕۆن.**

**دوو ڕبە گەنم.**

**دوو گەز جاو و هی دی.**

# ئامرازی پێوەندی و پاشبەندەکانی

بەرامبەر بە نەبوونی پاشگری ناوی لە زماندا، ژمارەیەکی زۆر لە ئامرازی پێوەندی و پاشبەندەکانی هەن.

ئامرازی پێوەندی لە شێوەی سلێمانیدا دابەشدەکرێتە سەر دوو بەش:

**بنجی: لە، بە، بۆ، بێ، (هە) تا.**

**نابنجی: (لە) لای، لەبەر، لەژێر، لەناو // لەنێو، لە بەیانی، لە نزیکی، لەسەر، لەپاش، لەپێش، لەپشت، لەتەنشت، لەکوێی، لەجێی ، لەجیات، بە (لە) دەورەی // دەوری، بە دوووی، لە دووای، بەشوێن، بەهۆی، لەبابەت.**

ئامرازی (لەگەڵ، لەباتی، لەبارەی) شوێنی تایبەتیان لەنێو ئەم ئامرازانەدا هەیە ، باوەکو وشەی بەرامبەریان نییە، بەڵام لە ڕووی دارشتن و ئەرکەوە بە ئامرازی نێوەوە دەلکێن.

هەروا جۆرە گروپێکی دیش شوێنێکی تایبەتی خۆی هەیە، کە لە لێکدانی ئامرازی پێوەندی بنجی لەگەڵ جێناوی لکاوی (ـ ێ)دا دەبێت، وەك: لێ، پێ، تێ.

گروپی ئامرازی پێوەندی نابنجی لە کۆمەڵە ناوێکیش پێکدێن، کە ئەرکی پێوەندی و بەندیواری پاراستووە، لەگەڵ ئەو ناوانەی لێی دارێژراون. ئامرازی پێوەندی نابنجی چۆن لەگەڵ ئامرازی خستنەسەردا دەبێت، هەروا بێ ئەو ئامرازەش بەکاردێت و ئەرکی ئامرازی پێوەندی بنجی دەگێرێت، کە دەوری ڕێزمانی دەبینێت.

ئامرازی پێوەندی بەتەنیا دەور دەگێرێت، هەروا بۆی هەیە پاشکۆی (ـ ەوە) وەیا (دا)ی لەگەڵ بەکاربێت و پێوەی بلکێت. لەو بارەدا بەهێزی دەربڕینی و هەروا سەربەخۆیی ئامرازەکە پێشان دەدات، کە بەبێ ئەوانە بەکارنایەن، بۆیە دەڵێن هەر ئەو پێوەندییە بۆی هەیە بەهۆی ئامراز وەیا ئامراز و پاشکۆکەیەوە دەربڕێت.

ئامرازی پێوەندی بنجی واتای جۆراوجۆر و کاتی ئۆبێکت دەست نیشان دەکات.

ئامرازی پێوەندی نابنجی پێوەندێکی فراوانتر دەبەخشێت. بەشێك لەم ئامرازانە بۆی هەیە پێوەندی ئۆبێکتی بنوێنێت، بەشێکی دی ئەم گروپەیە لەگەڵ پیشان دانی ئۆبێکت پێوەندێکی دیاری کراویش دەست نیشان دەکات.

ئەو ئامرازانەی کەوتوونەتە نێوان ئەم دوو جۆرەوەش پێوەندی ئۆبێکتی (کراوی) پێشان دەدەن.

تایبەتێتی ئامرازی پێوەندی لە شێوەی سلێمانیدا بەکارهاتنی ئامرازە لەپاش بەرکاری تیان، کە برێتیە لەجێناوی لکاوی کەسی.

**بەکارهێنانی ئامرازی پێوەندی بنجی**

ئامرازی پێوەندی ـ لە : یەکێکە لەو ئامرازە هەرە واتادارانەی ڕێزمانی، کە چۆن بەتەنیا بەبێ پاشبەندەکانی بەکاردێت، هەروا لەگەڵ پاشبەندەکانیشی بەکاردێت.

آ- بەکارهێنانی ئامرازی پێوەندی ـ لە ـ بە تەنیا:

١) واتای دەرچوون لەبۆشایی (لەگەڵ ئەو کارانەی، کە مانای دەرچوون دەبەخشن):

**گۆزە هەموو جارێك بە ساخی لەکانی ناگەرێتەوە.**

**لەباخەکە دەرکەوت و ڕۆیشت**

کە ئامرازی (لە) واتای دەرچوون و کۆتایی پێهێنان لە بۆشاییدا دەگەیەنێت ئەم واتا دیاریکراوانەی خوارەوە دەبەخشێت:

أ) دوورکەوتنەوە:

**لە دێیەکە دوورکەوتن.**

ب) سەرچاوەی دەرهێنانی کەرەستە:

**شەکر لە قامیش دەرئەهێنرێ.**

پ) بەشبەشکردن:

**مانگ بەشێکی لەباخچەکە رۆشنکردووە.**

ت) بەراوردکردن:

**لە رێوی پێچترە.**

٢) واتای شوێن دەبەخشێت (لەگەڵ کاری چەسپیو و نەجووڵاو) دا:

**لەشاخ و چیا گوڵ گەشایەوە.**

لەم بارەی لەپێشوو باسکراودا بە شێوەیەکی گشتی پاشکۆی (دا) لەگەڵ ئامرازی پێوەندی (لە) بەکاردێت.

٢) واتای رێچکە دەبەخشێت (لەگەڵ ئەو کارانەی رێچکە پێشان دەدەن):

**لەتەنوور نێزیك بوومەوە.**

**لە ناڵیش ئەدا لەبزماریش.**

٤) واتای گواستنەوە دەگەیەنێت لەگەڵ ئەو کارانەی، کە رێچکەی جووڵانەوە پێشان دەدەن :

**لەمێژ نەبوو لە دەشتەکە دەریازبووبوون و لە رووباری بەرازگر پەڕیبوونەوە.**

ب ـ بەکارهێنانی ئامرازی پێوەندی (لە) لەگەڵ پاشبەندا :

لەگەڵ (ـ ەوە)دا ئەم واتایانەی خوارەوە دەبەخشێت:

١) دەرچوون لە بۆشایی:

أ- لەگەڵ ئەو کارانەی، کە واتای دەرچون و کۆتایی پێهێنان دەگەیەنێت:

**کوردەکان لە قەڵاکەوە دەرکەوتن.**

ب ـ لەگەڵ ئەو کارانەی، کە واتای پێشوو نابەخشن:

**کوڕەکە لەبنی بیرەکەوە هاواری ئەکرد.**

پ ـ لەگەڵ ئەو کارانەی هەردوو ڕێچکەی هاتوچۆکردن و گەیشتن دەست نیشان دەکات و شوێنی ئەنجامیش پێشان دەدات.

**لە کەرکووکەوە هاتۆتە ئێرە.**

٢ـ سەرەتای کات دەست نیشان دەکات:

**لەنیوەڕۆوە باران ئەبارێ.**

**لەبەیانێوە تا ئێوارە لەوێ دانیشتووە.**

٣ـ نیشانەیەکی دیارکراوی سەرهەڵدانە:

**ئەمزانی ئەو نەخۆشییە لە خواردنەوەی ئاوی پیسی جنوویەوە بوو.**

٤ـ گواستنەوە دەگەیەنێت (لەگەڵ ئەو کارانەی ڕێچکەی جووڵانەوە دەست نیشان دەکەن):

**نابێ لە دەرگاشەوە کەس بتبینێ.**

٥ـ لەلێکدانی لەگەڵ ناوی (ماڵ)دا.

**لەماڵەوە ئیش ئەکات.**

لەگەڵ پاشبەندی ( ـ دا // ـ ا)دا واتای شوێن دەبەخشێت:

**لە حەو ئاسمانا ئەستێرەیەکی نییە.**

هەروا بۆ پێشاندانی کات و کراوی دیاردا بەکاردێت:

**کوردستان لە بەهارا بەهەشتە.**

**لەو خەیاڵانەدا بوو، کە وورده وورده خەو بردیەوە.**

**لە غەریبی دا بووین.**

ئامرازی پێوەندی (بۆ) چۆن بەتەنیا بەکاردێت، ئاوا لەگەڵ پاشبەندیشدا بەکاردێت:

بەکارهێنانی ئامرازی (بۆ) بەتەنیا:

**بە دەرزی بیر هەڵناکەندرێت. (پەند)**

١ـ بەواتای ئامرازێکی پێوەندیدار بەکاردێت:

أ ـ بۆ واتای کات:

**بەچەند ڕۆژ گەیشتنە بەغدا.**

ب ـ بۆ واتای نرخاندن:

**کتێبەکەم بەدوو دینار کڕی.**

٢ـ واتای هۆی ڕوودانی کاری ڕوودراو دەبەخشێت:

**من بەکوردی پێت ئەڵێم.**

**سەری بەسەردا گرت و بە زەردەخەنەیێکەوە وتی ..**

٣ـ واتای کاتی ڕووداوی تەواو دەبەخشێت:

**بەشەو جەردە بە ڕۆژ مەردە. (پەند)**

٤ـ مانای هاوڕوودانی ڕووداو دەبەخشێت:

**بەچاوپێکەوتنی براکەی زۆر کەیف خۆش بوو.**

٥ـ پێوەندی بیری دەست نیشان دەکات:

**بەم حیسابە، بە فکری ئەو.**

٦ـ ڕێچکەی ڕووداو پێشان دەدات:

**سەگ بە مانگەشە و ئەوەڕێت.**

**ئەمری کرد بە وەزیرەکەی.**

ب ـ بەکارهێنانی ئامرازی پێوەندی (بە) لەگەڵ پاشبەندەکاندا.

لەگەڵ پاشبەندی ( ـ ەوە) ئەم واتایانە دەبەخشێت:

١ـ هۆ و چۆنیەتی ڕووداو:

**بە ساردییەکەوە سڵاوم لێکرد.**

٢ـ ڕێچکە:

**خەدیجە گوێی نابوو بە دەرگاکەوە.**

٣ـ تێکرای کۆمەڵێك ڕووداو:

**لەپاشا بە هەردوو منداڵەکانەوە هاتەماڵەوە.**

لەگەڵ پاشبەندی (ـ دا) دا بۆ ئەم واتایانە بەکاردێت:

١ـ کەس (بە دەگمەن شت)، کە بەهۆی ئەوەوە ڕووداوەکە ڕوودەدات:

**نامەکەم بە دۆستما نارد.**

٢ـ گواستنەوە:

**هەوا بە لووت و قورگا تێپەڕ ئەبێت و گەرم ئەبێت.**

٣ـ شوێنی ئەو شتەی کە ڕووداوی لەسەر ڕوو دەدات:

**بە ژوورەکەدا ئەهات و ئەچوو.**

**فرمێسکێك بە ڕووی پاشادا هاتە خوارەوە.**

٤ـ ڕێچکەی ڕووداو بەرەو ژووروو وەیا بەرەو ناوەوەی شت.

**زرمەیەك هات و تۆپە بە ئاسمانا چوو.**

**دارا بزمارەکەی بە مێزەکەدا داکوتاند.**

ئامرازی پێوەندی (بۆ) ئەم واتایانەی خوارەوە دەبەخشێت.

١ـ ڕێچکە:

**کاپتان دەستی درێژکرد بۆ دەستی کچە.**

**ناچار گەڕامەوە بۆ دێی عازەبان.**

بۆ هەمان واتای نـاوبراو ئـامرازی پێوەنـدی لەگـەڵ پاشـگۆی (ـ ەوە)دا بـەکاردێت، بەڵام هەر تەنیا لەگەڵ ناوی (ماڵ)دا:

**ئەگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە.**

( ـ بـۆ ماڵـەوە ـ بـەراورد بکـە لەگـەڵ دارشـتنی ئاوەڵکـاری هاوچەشـنی، وەك بـۆ سەرەوە، بۆ خوارەوە و هی دی).

٢ـ کەس:

مەبەست لەو کەسەیە ، کە ڕووداوەکە لە پێناوی ئەودا ڕوودەدات:

**کتێبەکانت بۆ ئەنێرم.**

٣ـ ئامانج:

**ئیتر هەڵستان بۆ ڕۆیشتن، ئەبینن پێڵاویان دیار نییە.**

٤ـ هۆ:

**ئەبم بە شێت بۆ زوڵفت.**

٥ـ کات:

**بۆ بەیانی نووسراوەکەم بردەوە.**

ئامرازە پێوەندی (بێ) نەبوونی شتیش دەست نیشان دەکات:

**مزگەوت بێ مەلا نابێت. (پەند)**

ئامرازی پێوەندی (بێ) لەگەڵ ئامرازی پێوەندی (بە)ش بەکاردێت.

**نە تۆ بەبێ من، نە من بەبێ تۆ.**

.ئامرازی { هە (تا) } واتای کات و ماوەی ڕوودانی ڕووداو دەست نیشان دەکات:

**من هەتا سلێمانی ئەچم.**

**بەلام من بەڕاستی پێت ئەلێم، کە تا هەفتەیەکی تر ناژی.**

جۆری بەکارهێنانی ئامرازی پێوەندی بنجی لە خشتەی ژمارە (٥)ی کۆتایی ئەم باسەدا ڕوون کراوەتەوە.

## بەکارهێنانی ئامرازی بنجی لەگەڵ جێناوی لکاوی (ـ یٚ)

ئامرازی سادەی (لە، بە، دە) بە لێکدانیان لەگەڵ جێناوی لکاوی (ـ یٚ) ئامرازی نەسادەی (لیٚ، پیٚ، تیٚ) دروستدەکەن.

ئامرازی لێکدراو بە شێوەیەکی گشتی پێوەندی ئۆبێکتی (کراوی) ڕوون دەکاتەوە، لەو کاتەدا، کە بەرکاری تیان برێتی دەبێت لەجێناوی لکاو وەیا کۆتایی کار لەگەڵ کاری تێپەری رابوردوودا.

کە بەرکاری تیان برێتی دەبێت لە جێناوی لکاوی کەسی، ئامرازی لێکدراو چۆن دەکەوێتە پێش ناوەوە ئاواش دەکەوێتە پاشێوە. لەو کاتانەدا ئامراز دەکەوێتە پێش بەرکارەوە، کە بەرکاری ڕاستەوخۆ لە ڕستەدا نابێت، بۆ وێنە:

**لێیان ئەپرسم.**

**پێم بلیٚ.**

ئەگەر لە ڕستەدا بەرکاری ڕاستەوخۆ هەبوو و بەرکاری تیانیش برێتی بوو لە جێناوی لکاوی کەسی، ئەوا ئامرازی پێوەندی لێکدراو دەکەوێتە دوایانەوە:

**تۆ ئەم سەگ و گورگانەم لیٚ دووربخەرەوە.**

**ئەمن دەرمانەکەت پیٚ ئەدەم.**

## ئامرازی لکاوی ( ـ ە)

لە شێوەی سلێمانیدا ئەو کارەی ڕێچکەی ڕووداو ڕووندەکاتەوە، بۆی هەیە بەهۆی ئامرازی لکاوی ( ـ ە)وە (٢٩) بە ئۆبێکتی (کراو)ی ڕووداوەکەوە پێوەستدار بێت، لەم

بارەدا ئەم ناوەی ، کە دەوری کراوی گێراوە دەکەوێتە دوای کارەکەوە:

**هەرکە گەیشتینە شار منیان خستە بەندیخانە.**

**کامتان هاتە کوردستان؟**

**ناچار ڕووم کردە عازەبان.**

**سەری هەڵبڕی و چاوەکانی بڕییە ئاسمان.**

ئەو ئۆبێکتی (کراو)ەی ڕێچکـەی ڕووداو پێشـاندەدات، لەوانەیـە پاشـکۆی ئـامرازی پێوەندیشی بچێتە سەر (بەتایبەتی پاشکۆی - ەوە)

**لەوێ خستنیانەوە بەندیخانەوە.**

**ئەوان کەی هاتنە ماڵەوە ؟**

**منداڵەکە خۆی کوتایە تاریکیەوە.**

**لەپاشا گەڕایەوە دێیەکە** [٣٠]

هێندێك جار ئامرازی ناوی دەکەوێتە نێـوان ئـەو کـارەی ئـامرازی لکـاوی (- ە) ی پێوەلکـاوە و لەگـەڵ نـاوی ئۆبێکتـی لێکـی دەدەن، ئـەو بـارەش ڕێچکـەی ڕوودانـی ڕووداوەکە پتەوتر دەکات.

**خۆر ئەکەوێتە ناو ئاشەکەوە.**

**کە گەیشتینە بەر دەرگا گەلاوێژ ڕاوەستا.**

لـەپاڵ ئـەو جـۆرە کارانـەی لەمەوبـەر باسـکران کـاری (بـوون)یـش هــەمان دەور دەگێڕێت و ئامرازی لکاوی ( - ە)ی بە کۆتاییەوە دەلکێت.

**کەی ئەبیتە پیاو ؟**

ئەم ڕستەیەی پێشو لەگەڵ ئـەم ڕسـتەی ژێـروو بـەراورد بکـە، کـە ئـامرازی (بـە) شوێنی (- ە)ی گرتۆتەوە و کەوتۆتە دوای کارەوە:

ئەبێ ببی بە پۆلیس .

**بەکارهێنانی ئامرازی نابنجی**

ئامرازی (لە) لای (لەگەڵ ـ لا ـ دا بەراوردی بکە) شوێن (لە بۆشاییەکی بەر ئاوەڵەدا) دەست نیشان دەکات:

**لەلای مزگەوتەکەوە ڕاوەستابوو.**

**لای من هەمیشە بەهارە.**

ئامرازی ـ بۆلای ـ ڕێچکە پێشان دەدات:

**لە بەندیخانە دێت بۆ لای ئەم نیشتمانە.**

ئامرازی ـ بۆلای ـ کات پێشان دەدا:

**بەلای ئێوارە گەراینە ماڵەوە.**

لێکدانی ئامرازی ـ بەلای ـ لەگەڵ پاشکۆی ( ـ دا)دا جووڵانەوە بەرەو شت دەست نیشان دەکات.

**ڕۆستەم بەلای زەوێکەی ئەمانا تێپەڕی.**

**ژنەکە بەلای مندا ڕۆیشت.**

ئامرازی لەبەر (لەگەڵ ـ بەر ـ دا بەراوردی بکە) ئەم واتایانە دەبەخشێت:

**١ـ هۆ:**

**کورەکە لەبەر تۆ ئەروات.**

**٢ـ ئامانج:**

**لەبەر یەك زەردەخەنەی لێوەبکات جیهان ئەکا سەرانسەر گرییە و شین.**

بەلێکدانی لەبەر لەگەڵ ( ـ دا)دا شوێنی کەس، شت پێشان دەدرێت:

**ئەفسەرەکە لەبەر پەنجەرەکەدا ڕاوەستا.**

**لەبەر شەوقی مانگە شەوەکە ڕووخساری زۆر باش ئەبینرا.**

لە ئامرازی پێوەندی ـ بە ـ دا ئامرازی ئاوەڵکاری دادەڕێژرێت:

١ـ بەرانبەر // بەرامبەر:

**بەرامبەر ماڵەکەمان ژوورێکی ڕووخاو هەبوو.**

ب ـ بەرەو (ەوە) ـ ڕێچکە پێشان دەدات:

**بەرەو ئێرە دێت، ئەترسم ، کە بمێنێ توورە ئەبێ.**

ئامرازی لەژێر لەگەڵ (ژێر)دا بەراورد بکە، کە ڕێچکەی بزووتنەوە لەژێر شتەوە دەست نیشان دەکات.

**دەستێکی لەژێر لێفەکەوە دەرهێنا.**

**سەرینی لەژێر سەری دەرکێشا.**

ئامرازی پێوەندی لەناو // لەنێو (لەگەڵ ناودا بەراوردی بکە) بە لێکدانی لەگەڵ (دا)دا ناوەوەی شت دەست نیشان دەکات.

**گەوهەر لەناو قوڕدا ون نابێت (پەند)**

**لەنێویاندا ئاسنگەرێکی ئازا پەیدا بوو.**

کە ئامرازی لەناو لەگەڵ پاشکۆی ( ـ ەوە )دا لێکدەدەن، ناوەوەی هەر جۆرە شتێك بێت روون دەکرێتەوە:

**لەناو ئاگرەکەوە دەری هێنام.**

ئامرازی لەنێوان بەتەنیا هیچ واتایەك نابەخشێت، بەلاَم لە لێکدانی دا لەگەڵ پاشکۆی (دا) دا پێوەندی نێوان دوو ڕوودا و (بە دەگمەن زێتر) وەیا کەس پیشان دەدات:

**لەنێوانی من و تۆدا دۆستایەتێکی زۆر هەیە**

ئامرازی لەبەینی (لەگەڵ بەین دا بەراوردی بکە) پێوەندی نێوان هەر کەسان، بەڵکو شتانیش دەست نیشان دەکات):

**لەبەینی ئەم دوو وشەیەدا بەندیواری هەیە.**

ئامرازی لەنزیك (لەگەڵ نزیك دا بەراورد بکە)

نزیکترین پێوانەی (پێوەندی کات، چەندێتی و بەرئاوەڵەیی بۆشایی) دەست نیشان دەکات.

**نزیك چل رۆژ بەبەزم و ئاهەنگ خەریك بوو.**

**کانی سەوزە نزیکەی سەد ماڵی تیایە.**

لەلێکدانی ئامرازی لەنزیك لەگەڵ پاشکۆی (ـ ەوە) دا شوێن وەیا جووڵانەوە لەنزیکەوە روون دەکاتەوە:

**لەنزیك جۆگە ئاوێکدا دانیشتن.**

**لەنزیك دارەکەوە کەوتم.**

ئامرازی (لە) سەر (لەگەڵ سەردا بەراوردی بکە) ئەم واتایانە دەگەیەنێت:

١- هەبوون وەیا جووڵانەوەی رووداوێك لەسەر هەرشتێکدا بێت:

**مەلا ئەیوت ئەم دنیایە لەسەر پشتی گایەکە، گایەکەش لەسەر پشتی ماسییە.**

**پیرەمێردێك لەسەر کورسێکە دانیشتبوو.**

ب- رێچکە بەرەو ژووروو وەیا سەر رووبەری شت دەست نیشان دەکات:

**خوێن وەك یاقووت تك تك سەر زەوی ئەکەوت.**

**ئافرەت پێچەکەی لەسەر رووی لادا هەناسەیەکی هەڵکێشا و وتی..**

پ ـ هەروا واتای ئۆبێکتی بەرئاوەڵەیی دەست نیشان دەکات. (هۆی رووداو روون دەکاتەوە):

**لەسەر سەختیم بووم، کە مام.**

**پاشاش لەسەر بەلێنەکەی خۆی فەرمانیدا و سەری هەموویانیان پەڕاند.**

**لەسەر تووتن باسێکی نووسیوە.**

**لەسەر حسێبی ڕەنجی هەژاران بەشارەکانی ئەمریکادا ئەگەڕان.**

لەلێکدانی سەر لە (لەگەڵ ئامرازی بنجیدا) کات پێشان دەدات:

**سەر لەبەیانی وەرەماڵەوە.**

**سەر لە ئێوارەیەك کورەکە ئەچێ بۆ ڕاو.**

کە ئامرازی بەسەر لەگەڵ پاشکۆی (دا)دا ئەم واتایانەی خوارەوە دەبەخشێت:

آ) جووڵانەوە بەرەو ژوورروو وەیا لەسەر ڕووی شت پێشان دەدات:

**فرمێسك بەسەر ڕوومەتیا ئەهاتە خوارەوە.**

**سەری بەسەر کاغەزەکەدا شۆڕ ئەکردەوە.**

ب - ڕێچکەی ڕووداو (لە پانتایی و بۆشاییدا):

**خوێنەکەی بەسەر ئەرزا ئەرژا.**

**لەپڕ دارەکەی فڕێدا و نەڕانی بەسەر ژەندەرمەکەدا.**

لێکدانی بەسەر لەگەڵ ( - ەوە)دا بوونی هەر شتێك بێت لەسەر شتی دیدا پێشان دەدات.

**وەك مەیموون بەسەر دارەوە ئەژین.**

**ئێستا ناوی بەسەر هەموو دەمێکەوەیە.**

ئامرازی لەپاش هەڵوێستی دووای ڕوودان پێشان دەدات:

**لەپاش کوژرانی باوکی بەئەمری کەریم خان ئاغا محەمەد هێنرا بۆ شیراز.**

ئامرازی لەپێش هەڵوێستی ڕوودانی پێش ڕووداوەکە دەست نیشان دەکات:

**ئەی پێش ئەو چیت ئەکرد.**

ئامرازی پێوەندی لەپشت (لەگەڵ پشت دا بەراوردی بکە) کە لەگەڵ پاشگری ( - ەوە) دا بەکاردێت و ئەم واتایانەی خوارەوە دەبەخشێت:

أ) کەوتنە پاش هەر چ کەسێك وەیا هەر چ شتێکەوە:

**فەرهادیش لەپشت مێزەکەوە دانیشتبوو.**

ب) ڕێچکەی ڕوودا و لەدووای شت وەیا لەدووای شتەوە دەست پێکردن:

**کچەش ڕۆیشت و لە پشتەوە ڕاوەستا.**

**لەپشت دەرگاکە هاتە دەرەوە**

ئـامرازی پێوەنـدی لەتەنیشـت (تەنیشـت لەگـەڵ لەتەنیشـتدا بـەراورد بکـە) لەبەکارهێنانیدا لەگەڵ (ـ ەوە) واتای کەوتنی یان هەبوونی شتە وەیـا کەسێکە لـەلای کەسێکەوە یانیش شتێکەوە:

**ڕۆژێك لەڕۆژان، کە کورەکە لەتەنیشت باوکێوە دانیشتبوو.**

**خانوەکەمان لەتەنیشت ڕووبارەکەوە هەڵکەوتووە.**

ئامرازی لەگوێ (لەگەڵ گوێدا بەراورد بکە) شوێن دەست نیشان دەکـات، کـە لـە قەراخ شوێنێکی تر وەیا لەلایەوە:

**لە خواروی ئەوانیشەوە کوڕەکەی عەلی ئەفەنی لەلای رادیۆکە دانیشتبوو.**

ئامرازی لەجێی // جیات (لەگەڵ جێدا بەراور بکە) بە واتای برێتی بەکاردێت:

**لەجێی تۆ ئیش ئەکەم.**

**کە بەیانی لەخەو ڕاپەڕین، تەماشایان کرد لە جێی حەمە کوڕێك بەستراوەتەوە.**

ئـامرازی بـەدەوری // دەوری (لەگـەڵ دەورەدا بـەراوردیان بکـە) لەگـەڵ ( ـ دا)دا واتای سووڕان بەدەوروبەری کەسێك وەیا شتێك دا دەگەیەنێت.

**بەدەوری کانییەکەدا لباد و بەڕە داخرابوون.**

**مـیر سـولەیمان بـەگ لـە ماوەیـەکی کـەم دا توانـی، کـە زۆر لـەمیرەکانی کـورد لەدەورەی خۆی کۆبکاتەوە.**

هاوواتـای ئـەم ئامرازەی پێشـوو چـەند ئـامرازێکی دارێـژراوی ئاوەڵکارییـە، وەك دەوران دەور، دەوروبەر، دەوروپشت.

ئامرازی لێکدراوی بـەدووی .. دا (لەگـەڵ دوودا بـەراورد بکـە) جووڵانـەوەی دوای ڕووداو ڕوون دەکاتەوە:

**کچەش بەدوایدا ڕۆیشت.**

**پەلە مەکە بەدووی مندا وەرە.**

ئامرازی دارێژراو (لە) دوای، کە لە دووی وەرگیراوە پێوەندی کات دەست نیشان دەکات:

**ئاشتی دوای شەڕ خۆشە.**

**لەدوای سێ سەعات گەیشتنە شارەکە.**

لەبەکارهێنانی ئامرازی بەشوێن (لەگەڵ شوێندا بەراوردی بکە) لەگەڵ (ـ دا) دا ئەو کەسە دەگەیەنێت، کە دەوری بەرکاری مەبەستکراوی گێڕاوە:

**باوکم منی نارد بە شوێنتا.**

**بەشوێن براکەیا ڕوو بەئیسفەهان بەڕێ کەوت.**

ئامرازی بەهۆی (لەگەڵ ـ هۆ ـ دا بەراوردی بکە) هێندێک جار لەگەڵ پاشکۆی ( ـ ەوە) دا بەکاردێت و ئەو کەسە وەیا شتە دەست نیشان دەکات، کە بە هۆیەوە ڕووداوەکە ڕوودەدات:

**ئەحمەد بەهۆی پیرێژنەکەوە خۆی ئەگەیەنێتە شاییەکە.**

**سبەی شەوێ ئەفسەرەکان بەهۆی ماشینەکە لە سەقزەوە دێنە کانی سەوزە.**

ئامرازی لەبابەت (لەگەڵ ـ بابەت ـ دا بەراوردی بکە)، کە لەگەڵ ( ـ ەوە)دا بەکاردێت، یارمەتی ڕوون کردنەوەی کراو (ئۆبێکت)ی قسە وەیا بیرەکە دەدات:

**لەبابەت ئەمەوە هیچم نەبیستووە.**

**یەکێ لەو کاغەزەی تەماشام کرد لە بابەت ژنێکەوە بوو.**

هاوواتای ئەم ئامرازە (لەبارەی // دەربارەی)، کە بەیارمەتی ئامرازی خستنە سەرەوە دادەرێژرێت:

**ئارەزوو ئەکەم، کە چیرۆکێکی بچووکتان پێشکێش بکەم لەبارەی شەری جیهانی یەکەمەوە.**

ئامرازی (لەمەر) هەمان واتای ئامرازی لە بابەت دەگەیەنێت:

ئامرازی لەگەڵ لەبەکارهێنانیدا لەگەڵ پاشکۆی (دا)دا هاوڕووداوی جۆراوجۆری ڕوودان دەگەیەنێت:

**ئایا ئارەزووت نییە لەگەڵ باوکتا لەم سەفەرەدا هاوڕێتی بکەی.**

**تانجیەکەمان برد لەگەڵ خۆمانا بۆ ڕاو.**

ئامرازی ـ لەباتی ـ هەمان واتای ئامرازی لەجێی دەگەیەنێت.

## بەکارهێنانی ئامراز لەدوای ناودا

لەگەل ئەو بارانەی لەسەرەوەدا باسکران، کە ئامرازی نەسادە تێیدا بەشداری کردبوو، باری دیش بەرچاو دەکەوێت، کە ئامرازەکە دەکەوێتە دوای ناوەوە بەتایبەتی ئامرازی بۆ و ئامرازی لەگەڵ، هەروا ئامرازی لەلا و لەسەر (ئامرازی نەسادەی : لێ، پێ و تی)یش هەمان دەور دەگێڕن:

کە بەرکاری تیان برێتی دەبێت لەجێناوی لکاوی کەسی وەیا کۆتایی کەسی کار ئەم ئامرازانە دەکەونە دوای ناوەوە:

**ئەم کوڕەم بۆ بانگ بکەن.**

**کابرا جێگای بۆ دانایین.**

**دەمەوێ قسەت لەگەڵ بکەم.**

**هیچی ترم لەلا نییە.**

. هەروەکو لەم وێنانەی سەرەوەدا دیارە ئامراز کەوتۆتە دوای بەرکاری ڕاستەوخۆوە (وەیا دیارخەری بەرکارەوە)، کە جێناوی لکاوی پێوە نووساوە و کراو (ئۆبێکتی)ی تیانی دەربڕیوە و کەوتۆتە دوای بەرکاری ڕاستەوخۆوە:

**ئەو کەوشانەم لای بۆیاخچی بۆ بۆیاخ کە.**

ئەگەر بەرکاری ڕاستەوخۆ لە ڕستەدا نەبوو، ئەوا جێناوی لکاوی کەسی بە

کۆتایی بەشێکی دی ڕستەوە دەلکێت:

**هەرچەندی لەگەڵ خەریك بوو، هیچ کەلکی نەگرت.**

ئەو بەرکاری تیانەی، کە بریتیە لەکۆتایی کەسی کار، ئامرازی پێوەندێکەی دەکەوێتە پێش کارەوە:

**دوایی دەرگای دەرەوەیان بۆ کردمەوە و بەیەك شەق فرییان دامە کۆڵان.**

| ئامرازی (لە) بەبێ پاشبەند | ئامرازی (لە) + پاشبەندی - ەوە | ئامرازی (لە) + پاشبەندی (د)ا |
|---|---|---|
| دەرچوون<br>شوێن<br>ڕێچکە<br>جووڵانەوە بەنێو<br>بەناودا | دەرچوون<br>شوێن (کەم بەکار دێت)<br>جووڵانەوە بەنێو<br>بەناودا | شوێن |
| ئـــامرازی (بـــە) بـــەبێ پاشبەند | ئامرازی (بە)<br>+ پاشبەندی ـ ەوە | ئـــامرازی (بـــە) + پاشبەندی (د)ا |
| ئامراز<br>هۆی ڕووداو<br>کاتی ڕوودانی ڕووداو<br>ڕێچکە | ـــــ<br>هۆی ڕووداو<br>ڕووداوی تێکرایی<br>ڕێچکە | ئامراز<br>ـــــ<br>شوێن<br>ڕێچکە |
| ئامرازی (بۆ)<br>بەبێ پاشکۆ | ئامرازی (بۆ)<br>+ پاشکۆی - ەوە | |
| ڕێچکە<br>ئامانج<br>هۆ | ڕێچکە (کەم بەکاردێت) | |

# ئاوەڵکار

ئاوەڵکار دابەشدەکرێتە سەر دوو بەشی سەرەکی: ئاوەڵکاری بنجی و ئاوەڵکاری دارێژراو.

ئاوەڵکاری بنجی ئەو ئاوەڵکارەیە، کە ناگۆڕێت و دەوری ئاوەڵوشەی کار (ئاوەڵگوزارە) دەگێڕێت. بەشی هەرە واتاداری ئەم جۆرە ئاوەڵکارانە ئەو بەشانەن، کە بەناو و جێناوەوە پێوەستن:

**ئێستا، هێشتا، ئنجا، ئینجا، ئەوسا، ئەوسایە، خێرا، کەی، کوێ، ئێرە، لێرە، کوا، کوانێ، لەوێ، ئەوێ، هەمیشە، هەنوو، هەنووکە، دیسان، دیسانەوە، ناکاو، لەناکاو، تەنانەت، پێکەوە، دوێنێ، ئەمڕۆ، ئیمڕۆ، قەت، ئەمشەو، ئیمشەو، پەیتا پەیتا و هی دی.**

*وێنە:*

**ئیمشەو بیری لێ ئەکەمەوە، ئنجا، بەیانی دیسان چاومان بەیەك ئەکەوێتەوە.**

**هێشتا دە پانزە شووتی تیا ماوە سبەینێ بۆ ئەمانەش ئەگەڕێمەوە، ئنجا ئەوسا بێستانەکە بەڕەڵا ئەکەم.**

**ئەوە لەچی ئەگەڕێی لێرە.**

**ئەمجا ئێستا بڕۆم تۆ بڵێی بیگەمێ.**

**چاکەکەی، کە دوێنێ کردت پێویستە ئەمڕۆ پاداشتی وەرگرێتەوە (پەند).**

**باپێکەوە بڕۆین.**

## ئاوەڵکاری دارێژراو

بەشی جۆراوجۆری ئاخافتن دەگرێتەوە، کە ئەم گروپانەی خوارەوەی لێ پێکدێت:

١ـ ناو لەگەڵ نیشانەی کۆدا (ـ ان) ئاوەڵکاری کات دادەڕێژن:

**ئێواران، ئێوارە، شەوان، هاوینان، زستانان، پایزان، ساڵان، جاران، جەژنان.**

ئەم جۆرە دارشتنانەی خوارەوە هێندێك جار ئامرازی پێوەندییان بەپێش دەكەوێت:

**بەزستانان، بەشەوان و هی‌دی**

٢ـ ناو (ئاوەڵناو بەرادەیەكی كەمتر) نیشانەی ( ـ ێ)ی دۆخی تیانیان دەچێتە سەر و ئاوەڵكاری كات وەیا شوێنیان لێ دادەرێژرێت:

**بەهارێ، ژوورێ، دەرێ، خوارێ، هاوینێ، زستانێ، پایزێ و هی دی.**

٣ـ ناو (ئاوەڵناو و جێناو بەرادەیەكی كەمتر) بەلێكدانیان لەگەڵ نیشانەی نەناسیاری ـ ێ (ك) دا ئاوەڵكاری چۆنیەتی دادەرێژێت:

**گەلێ، رۆژێك، كەمێ، چەندێ، نەختێ و هی دی.**

٤ـ ناو، جێناو و ئامرازی پێوەندی و پاشبەندەكانی.

**لەژوورەوە، لە دەرەوە، لە ماڵەوە، لە دوورەوە، لە نزیكەوە، لەتەنیشتەوە، لە پێشەوە، لە پاشەوە، لەوێوە، لەكوێوە، لێرەوە و هی دی.**

٥ـ ئامرازی پێوەندی و ناو و ئامرازی پێوەندی و جێناو:

**بەهەڵكەوت، سەرلەنوێ، بەم رەنگە، بەم جۆرە، ئەم دیو، ئەو دیو، بەم زووانە، بەفركەیەك، بەفركانێك، لەمەودوا، هیچ وەخت، بەچەند، بەتایبەتی، لەهیچ كوێیەك، بۆكوێ، لەبەرچی، لەبەر ئەمە و هی دی.**

*وێنە:*

**پایزان میوە زۆرە.**

**ئەڵێن ئەگەر زستانان چۆلەكە پەلاماری ژووری دا ئەوە بەفرێكی زۆر قورس ئەبارێ.**

**ئێوارە، كە باوكی گەرایەوە دایكی پێی وت:**

**شەوێ لەناو جێگەكەدا كەوتە پەژارەی ئەوە، كە ئەمجارە چی بكرێ.**

**كورەكە كەمێ خۆی بۆ لاركردەوە.**

**دڵۆپە وەکو فرمێسك بە چلۆرەی ژێر کوێسوانە ـ کانا ئەهاتە خوارەوە.**

**لە هەوەڵەوە ئیشم دزیکردنی بوو.**

**لەوێوە چوومە لای براکەم.**

**بە فرکانێ بچۆ ئەو گوزەڵەیە پڕ بکە لە ئاوی سارد.**

لەدەوری ئاوەڵوشەیکار (ئاوەڵگوزارە) دا ئاوەڵناو و جێناویش هاوبەشـی دەکـەن و دۆخێکی سینتاکسی تایبەتیان دەبێت.

*زۆر، چۆن، چلۆن، واوەها، زوو، هەموو* و هی دی.

**ئەی ئەمە چۆن بزانم ؟**

**لەبەر ئەوە زۆر خۆشم ئەوێت.**

**باوکە گیان زوو بگەڕێرەوە زوو.**

**کوڕم وا مەڵێ.**

دەوڵەمەندترین ڕێگە و هۆی داڕشتنی ئاوەڵکاری دارێژراو دووپاتکردنەوەی ناوە:

**شەرمن ـ شەرمن، ووردە ـ ووردە، کەم ـ کەم، یەك ـ یەك، دەستە ـ دەستە و هـی دی.**

بەلێکدانی ناو لەگەڵ پاشگری ( ـ انە)دا ئاوەڵکار و ئاوەڵناوی دارێژراو دادەڕێژرێت:

**مەردانە، شێرانە، برایانە، ئازایانە.**

بـەلێکدانی نـاو لەگـەڵ پێشـگری (بـە)دا ئاوەڵکـاری دارێـژراو دادەرێژێـت، کـە هـۆو چۆنیەتی ڕوودانی ڕووداو دەست نیشان دەکات:

**بەچاکی، بەجوانی، بەدرێژایی، بەخۆرایی، بە گورجی، بەدڵخۆشی.**

***وێنە:***

**کچە شەرمن ـ شەرمن تەماشای بەرپێی خۆی کرد.**

**هێزێکی نهێنی کاری کردە بەسێ، شێرانە و مەردانە خەنجـەری لـە مشـتی هـەتیوە هەڵپرووکان و لەسەر سنگی هەتیوەی دانا.**

# کار

کار تایبەتێتی ڕەگەزی (کەتیگۆری) کەسی : یەکەم و دووەم و سێیەم، ژمارە: تاك و کۆ، کاتی: ڕانەبوردوو و داهاتوو، ڕابوردووی سادە، ڕابوردووی دوور، ڕابوردووی نێزیك، ڕابوردووی بەردەوامی[٣١]، دەمکاتی : ئیخباری، ئیلزامی و فرمان، تێپەڕ ، تێنەپەڕ ، کاری کارا دیار و کاری کارابزر[٣٢].

کار لە دوو ڕەگ دادەڕێژرێت، ڕەگی کاتی ڕانەبوردوو و ڕەگی کاتی ڕابوردوو.

لەڕووی دارشتنەوە کار دابەش دەبێتە سەر سادە، کە لە ڕەگی کار و نیشانەی کەسی و نیشانەی کار: ڕانەبوردوو ـ داهاتووی ئیلزامی و ئیخباری فرمان پێکهاتووە. کاری نەسادەش بریتیە لە ناوی کراوی کاری کاتی ڕابوردوو و شێوەی پێوەندی کەسی (دەمکاتی ئیخباری) وەیا لەبناغەی کاری ڕابردوو بەلێکدانی لەگەڵ کاری یارمەتیدەری (بوون).

کار دوو شێوەی ڕێزمانی هەیە، کە کەسیان تێدا بەدیار ناکەوێت، شێوەی چاوگ و شێوەی بکەری و کراوی.

## شێوەکانی کاری بێ بکەر

### چاوگ

چاوگ بریتیە لە ڕەگی کاتی ڕابوردوو و پێوەنووسانی پاشگری ( in // - n-) (لەگەڵ ئەو ڕەگانەی کۆتاییان بە بزوێن و نەبزوێن هاتووە:

**کردن > کرد** ، **هاتن > هات،**

**سووتان > سووتا** ، **سووتاندن > سووتاند،**

**ژماردن > ژمارد** ، **نووستن > نووست،**

**گریاندن > گریاند** ، **گیران > گیرا،**

**کوتران > کوترا ، کوژران > کوژرا،**

**کران > کرا** ، و هی دی

چاوگ نیشانەی کاری و نیشانەی ناوی تێدا کۆ دەبێتەوە. لە نیشانەکانی کار چاوگ بۆی هەیە واتای تێپەر و تێنەپەر ببەخشێت، وەك (کولان ـ کولاندن)، دەمکاتی دیار و بزر (نووسین ـ نووسران، تایبەتێتی ئاوەڵکاری ( زوو زوو ڕۆیشتن)، بەرکار وەرگرتن (کتێب خوێندنەوە).

هەروا چاوگ ئامرازی پێوەندی (بە)ی بەپێش دەکەوێت واتای ڕوودانی ڕووداو دەگەیەنێت، کە پێش ڕووداوێکی دی ڕوو دەدات:

**بە چاوپێکەوتنی براکەی زۆر کەیف خۆش بوو.**

**بە بیستنی ئەو قسانەی لێی چووە پێشەوە.**

تایبەتێتی ناوی لە چاوگ دا لەوەدا بە دیار دەکەوێت، کە وەکو ناو نیشانەی ناسیاری دەچێتە سەر:

**ئەو هەموو هاوار و پەنجەرە شکاندنە کەسی لەو ژوورە نەبزوان.**

هەروا نیشانەی نەناسیاریش وەردەگرێت:

**پێکەنینێکی زۆر گریانی لە دوایە.**

ئامرازی پێوەندی و پاشکۆکەشی لەگەڵدا بەکاردێت:

**لە گەڕانەوەیدا بەو خێراییە نە ئەڕۆیشت، کە بەیانی پێی هاتە دەرەوە.**

ئامرازی خستنە سەر و ئامرازی لکاوی شوێنی پێوەدەلکێت:

**بۆ فرۆشتنم هێناوە.**

**ئەگەر گۆشت خواردن گرانە، نەخواردنی هەرزانە.**

**لەپاش گەڕانەوەی براکەم.**

چاوگ لە ڕستەدا وەکو ناو دەوری سەرکار (نیهاد) دەگێڕێت:

**خوێندن بە کوردییە.**

**هەروا دەوری بەرکاری ڕستە دەبینێت:**

**دەستم کرد بە گەڕان.**

بەشی ناوی وشەیکار (گوزارە) ی ناوی ـ کاری:

**هەمیشە خەریکی کڕین و فرۆشتنە.**

## ناوی بکەر و ناوی کراو

تەنیا لە کاری ڕابوردوو دادەڕێژرێت، بە پێوەلکانی نیشانەی ـ وو // ـ و بە کۆتایی ڕەگی کاری ڕابوردووەوە: هاتوو لە (هاتن)ەوە، مردوو لە (مردن)ەوە نووسیو لە (نووسین) و هێناو لە (هێنان)ەوە. شێوەی نادیاریشی نیشانەی و / W وەردەگرێت: نووسراو، هێنراو، کراو، خوێنراو و هی دی.

لەشێوەی سلێمانیدا ناوی کراو، کە لە کاری ڕابوردوو داڕێژراوە هاوبەشی پێکهێنانی وشەی لێکدراو دەکات و دەکەوێتە دوای ناوەوە: **سەرمابردوو، باگرتوو، کرم خواردوو، دڵ شکاو، کڵاو دڕاو** و هی دی.

ناوی کراو وەکو ئاوەڵناو ئامرازی خستنە سەری دەچێتە سەر بە تایبەتی ئامرازی جۆری یەکەم ودووەمی:

**بە دەنگێکی تاساوی خنکاوەوە وتی.**

**هەستی ترسێکی نەزانراو ئەڕژایە گیانییەوە.**

**پاش نیوەڕۆش بە ڕێگا ڕاستە چەورێژکراوەکەدا دێیتەوە ماڵە پاك و خاوێنەکەت.**

هەروەکو لەم وێنانەی سەرەوەدا دیارە ناوی کراو وەکو ئاوەڵناو ئامرازی خستنەسەری ( ـ ە)ی دەچێتەسەر، بەڵام لە باری داخراوی دا نیشانەی ناسیاریش وەردەگرێت، کە ئەویش بۆ ناوی دیارخراو دەگەڕێتەوە و ناوەکەش نیشانەی کۆ و

پاشبەندی ئامرازی پێوەندی و جێناوی لکاویش وەردەگرێت (لە واتای کەسی بکەر و خاوەنیەتی)دا.

ناوی کراو نیشانەی دی ئاوەڵناوی لەگەڵدا ڕێکدەکەوێت، هێندێك لەو نیشانانە:

أ) بە پێی پلەکانی دەگۆڕێن:

**گەیوترین شووتی. (لەکاری گەیین)ەوە.**

ب) بەیارمەتی پاشگری (ـ ی) ناوی نسبی لێ دادەڕێژرێت:

**بە شڵەژاوی وتی. (لە شلەژان)ەوە.**

ب) نیشانەی دیار و نادیار و کۆ وەردەگرێت:

**ئەو کوژراوانە کێن؟ (لە کوژران)ەوە.**

## جۆرەکانی کاری داڕێژراو

کار لەڕووی داڕشتنەوە دابەش دەکرێتە سەر سادە و داڕێژراو بەهۆی پاشگر وەیا پێشگرەوە، یان بە یارمەتی هەردوویانەوە و جۆری لێکدراویشی هەیە.

## کاری سادە

کاری سادە ئەو کارە بنجیە دەگرێتەوە (کە هیچ بەشێکی ئاخاوتنەوە پێوەست نییە):

**دان، هێنان، مان، زانین، چوون، کەوتن، بردن، خواردن، ناردن، هاتن و هی دی**

وەیا نابنجییە و بەشێك لە کارەکە لەوانەیە بچێتەوە سەر ناو:

**د[illegible]دن)، لەرزین // لەرزان (لەرز)، لەوەڕان // لەوەرین (لەوەڕ)، ئێشان (ئیش)، [illegible]ـن (فیکە)، گرماندن (گرمە) و هی دی.**

لێرەدا پێویستە ئەوە تێبینی بکرێت، کەوا کاری سادەی بنجی ئەو کارانە دەگرێتە خۆی، کە چاوگەکانیان کۆتاییان بە (ـ ان ، ـ تان ، ـ دان) دێت و کاری سادەی

نابنجیش لەو چاوگانە وەردەگیرێن، کە کۆتاییان بە ( ـ ین ، ـ ان ، ـ اندن ) دێت.

لەدارشتنی کاری دارێژراودا بە یارمەتی پێشگر، دوو جۆرە پێشگر ـ سادە و نەسادە هاوبەشی دەکەن و واتای جۆراوجۆری پێ دەبەخشن.

ئەم پێشگرە سادانەی خوارەوە بەزۆری بۆ ئەم مەبەستە بەکاردێن:

١ـ *هەڵ* ـ واتای جوولانەوە بەرەو ژووروو دەبەخشێت:

**هەڵهێنان > هێنان.**

**هەڵفرین > فرین.**

**هەڵپەرین > پەرین**

**هەڵسان > ـــ**

**هەڵدروون > دروون**

**هەڵگلۆفتن > گلۆفتن**

**هەڵکەوتن > کەوتن** و هیدی.

٢ـ *دا* ـ واتای بزووتنەوە بەرەو ژێروو دەگەیەنێت:

**داچوون > چوون.**

**داخزان > خزان.**

**داپەرین > پەرین.**

**داخورپان > خورپان.**

**داچڵەکین > ـــــ**

**دامان > مان** و هی دی.

٣ـ پێشگری *دەر* ـ واتای رێچکە بەرەو دەرەوە دەگەیەنێت:

دەرچوون > **چوون.**

**دەرهێنان > هێنان.**

**دەرهاویشتن > هاویشتن** و هی دی.

٤ـ پێشگری *ڕا* ـ واتایەکی زۆر دەبەخشێت:

**ڕاخستن > خستن.**

**ڕاکشان > کشان.**

**ڕامان > مان.**

**ڕاکردن > کردن.**

**ڕامێشتن > مێشتن** و هی دی.

٥ـ پێشگری ڕۆ ـ لەگەڵ چەند کارێکدا لێکدەدرێت واتای چوونە خوارەوە دەگەیەنێت.

ڕۆنیشتن > نیشتن.

ڕۆچوون > چوون.

ڕۆکردن > کردن.

ڕۆکەوتن > کەوتن.

ڕۆنان > نان و هی دی.

٦ـ پێشگری وەر ـ واتای دووپاتکردنەوە و گەڕانەوەی ڕووداو دەبەخشێت:

**وەرچەرخان > چەرخان.**

**وەرگەڕان > گەڕان.**

**وەرگرتن > گرتن** و هی دی.

٧- پێشگری **لا** - ڕێچکەی ڕووداو بەرەو لایەك دەست نیشان دەكات:

**لابردن > بردن**

**لادان > دان**

**لاچوون > چوون**

**لاخستن > خستن**

**لاکردن > کردن** و هی دی.

پێشگری لێکدراو لەڕووی دارشتنی مۆرفۆلۆژێوە دابەشدەکرێتە سەر سێ بەش:

١- پێشگری *لێ، پێ، تێ* وێچوونێکی بە پێشگری لێکدراوەوە هەیە:

**لێدان > دان.**

**لێخستن > خستن.**

**لێنان > نان.**

**لێسەندن > سەندن.**

**پێزانین > زانین.**

**پێوەستان > وەستان.**

**پێووتن > ووتن.**

**پێویستن > ویستن.**

**تێبردن > بردن.**

**تێکردن > کردن.**

**تێگەیشتن > گەیشتن** و هی دی.

لێرەدا پێویستە تێبینی ئەوە بکرێت، کەوا گروپی ئەو وشـە دارێژراوانـەی بـە هـۆی ئەم پێشگرانەوە دارێژراون زۆر بەتوندی بەشێوە و جۆری دارشتنیانەوە پێوەستە. ئەو کارانەی بە یارمەتی ئەم پێشگرانەوە پێکهاتوون بـەزۆری تێپـەڕن و ئۆبێکتـی (کـراوی) تیان پێشان دەدەن ، کە برێتی دەبن لەجێناوی کەسی لکاو وەیا کۆتایی کەسی کار.

٢ـ پێشگری لێکدراوی تێدا // تیا، پێدا / پیا، تێوه // پێـوه، لێوه (ئـەو دووانـەی هەره دوایی کەم بەکاردێن):

**تێدامان، پێدا گەیشتن، پێوەدان، تێوەگلان، لێوەچوون** و هی دی.

٣ـ ئەو پێشگرانەی، کە بە لێکدان لەگەڵ ژماره یەك دا دارێژراون: لێك، پێـك، تێـك.

ئەم پێشگرانە ئەم واتایانەی خوارەوه بەو کاره دەبەخشن، کە لەگەڵیدا لێکدەدرێن:

أ) ڕووداوی هاوڕێچکە:

**لێکنان، لێکنووسین، لێکدووان، پێککەوتن، پێکهاتن، تێکگەیاندن**.

ب) جووڵانەوه بۆ لای جۆراوجۆر:

**لێکپرژاندن، لێکبوون، تێکدان**

**تێکشکان**.

## پاشگری کاری ـ ەوه

ئەو کـاره دارێـژراوەی بـه یارمـەتی ( ـ ەوه) دارێـژراوه (لەگـەڵ پاشـکۆی ـ ەوه دا بەراوردی بکه) واتای کاره سادەکه دەگۆڕێت:

**کردن** < **کردنەوه**، **بردن** < **بردنەوه**، **خواردن** < **خواردنەوه**، **گرتن** < **گرتنەوه**، **کوشتن** < **کوشتنەوه** و هی دی.

لەگەڵ کاری دیدا واتای دووبارەکردنەوه وەیا گەڕاندنەوه دەگەیەنێت:

**ووتن** < **ووتنەوه** ، **هاتن** < **هاتنەوه**، **شتن وەیا ششـتن** < **شـتنەوه یـان ششـتنەوه** و هی دی.

لەپاڵ ئەم گروپە کارانەی لە سەرەوه باسکران کۆمەڵێك کار هـەن (بەتایبـەتی ئـەو کارانـەی بـارودۆخ پێشـان دەدەن) کـه بـۆ هـەمان واتـا و مانایـانی دی بـەکاردێن و بـە یارمەتی پاشگری ( ـ ەوه) وەیا بەبێ ئەوەوه بەرچاو دەکەون:

**بریسکانـ (ەوه) ، چوونـ (ەوه) ، لێسینـ (ەوه) ، چەرخانـ (ەوه) ، ڕازاندنـ (ەوه) ،**

**کزان (ەوە)** ، **لاواندن (ەوە)** و هی دی.

گروپێکی دی کار هەن، کە تەنیا لەگەڵ پاشگری ( - ەوە) بەکاردێن:

**پارانەوە، لەرانەوە، شاردنەوە، هۆنینەوە، بەشینەوە، حەسانەوە، نووچانەوە، رووتانەوە.**

پاشگری ( - ەوە) بۆی هەیە بە کۆتایی کارێکی دی بلکێت، کە بە یارمەتی پێشگرەوە دارێژراوە، (بە تایبەتی ئەو کارە دارێژراوانەی پێشگری - لێ - ، دا -، هەڵ -، وەر - بە پێش کەوتووە) ئەم جۆرە دارشتنە کۆمەڵێك کاری دارێژ لە پێشگر و پاشگرەوە پێك دەهێنێت:

**وەرگرتنەوە، لێپرسینەوە، دامرکانەوە ، لێکردنەوە** و هی دی.

## کاری لێکدراو

ئەو کارە لێکدراوانەی بەهۆی بەشی ئاخافتنی ناوی (ناو، ئاوەڵناو) لەگەڵ کارێکی یارمەتیدەر دادەرێژرێن بەتایبەتی کاری **کردن**، **بوون**، **دان**، **گرتن** وەیا لەشێوەی دارێژراوی **کردنەوە**، **بوونەوە**، **دانەوە گرتنەوە** پێکدێن.

کاری کردن بۆی هەیە لەگەڵ ناو وەیا ئاوەڵناودا لێکبدات:

**بانگکردن، ماچکردن، بارکردن، وێرانکردن، شەرمکردن، خاڵیکردن** و هی دی.

بەلام لەگەڵ ئاوەڵناودا بەزۆری شێوەی دارێژراوی ئەم کارە، کە (کردنەوە)یە بەکاردێت:

پڕکردنەوە، بڵاوکردنەوە، جوێکردنەوە، بەرزکردنەوە، وشککردنەوە، کوڵ (کورت) کردنەوە (ئەم کارە لێکدراوانە بەبێ پاشگریش بەکاردێن هەر تەنیا کردن)؛ وشك کردن، سوورکردن، ووردکردن، (لەگەڵ ووردکردنەوەدا بەراوردی بکە)، زەردکردن، رۆشنکردن (لەگەڵ رۆشن کردنەوەدا بەراوردی بکە) و هی دی.

لەگەڵ کاری لێکدراوی گروپی یەکەمدا، کە کاری کردن هاوبەشی دارشتنی دەکات،

هێندێك جار دەنگی ( ـ ە) دەکەوێتە نێوان ناو و کارەکەوە:

**چیرەکردن، کۆکەکردن، فیرەکردن، مڵچە مڵچ کـردن، فیشـە فیـش کـردن، لەرەلـەر کردن، چەقە چەق کردن و هی دی..**

کاری بـوون بەشـێوەیەکی گشـتی لەگـەڵ ئاوەڵنـاودا لێکدەدات، بـۆ ئـەوەی کـاری لێکدراو دارێژێت، کە تێپەربوون لە ڕووی چۆنیەتی و دۆخێکی نوێدا پێشاندەدات:

**چاکبوونـەوە، سپیبوونەوە، کوێربوونـەوە، گـەورەبوون، سـەوزبوونەوە، پڕبـوون، تاریك بوون (کردن)، ووشك بوون، ووشك بوونەوە و هی دی.**

کـاری بـوون لەگـەڵ نـاودا کـەم بـەکاردێت، لەبـەکارهێنانیدا پاشـگری ( ـ ەوە)ی دەچێتە سەر:

**ڕۆژبوونەوە، گلبوونەوە، کۆبوونەوە و هی دی.**

کاری بوون (ـ ەوە) بۆی هەیە واتای بوون بـە ...، گەڕانـەوە بگەیـەنێت، تـەنیا لـەم بارەدا دەکەوێتە پێش ناوەوە، کە ئامرازی (بە) دەکەوێتە نێوانیانەوە:

**کە بووم بە سەعاتچی هەر گیرفانێکت سەعاتێکی تێ ئەخەم.**

**ڕێسەکەمان بووە بە خوری . (پەند).**

کاری دان ( ـ ەوە) و گرتن (کەمتر گرتنەوە) لەگەڵ ناودا لێك دەدەن:

**گوێـدان، گوێگرتـن، دڵدانـەوە، نـاندان، کاردانـەوە، کۆڵـدان، دەورەدان، بڕیـاردان، وەنەوزدان، هەوڵدان، ڕەنگدانـەوە، ڕوودان، پشـتگرتن، بـەرگرتن، ژەنگگرتـن (هێنـان، هەڵهێنان)، ئارامگرتن وهی دی.**

بۆ دارشتنی کاری لێکدراو هێندێك کاری دیش بەکاردێن، بەڵام بە شێوەیەکی کەمتر وەك:

**بردن : سەرمابردن، دەرزبردن، شکبردن، خواردن (خواردنەوە ـ کـەمتر بـەکاردێت) دەردخواردن، چەرخخواردن، گلخواردنەوە، سەرماخواردن و هی دی.**

**کەوتن (ەوە) نەخۆشکەوتن، سەرکەوتن، دوورکەوتن (ـ ەوە).**

**خستن (ەوە) ـ درەنگخستن، دوورخستنەوە، دواخستن و هی دی.**

کاری هێنان (کەمتر) خست ،ن کە لەگەڵ چاوگ دا لێکدەدەن هۆی روودانی پێ دەبەخشن:

**ئەگەر ئەم ئەوی هێنایە پێکەنین..**

**دۆست ئەوەیە ئەمگرێنێ، دوژمن ئەوەیە ئەمکەنێنێ (پەند).**

## جۆرەکانی کار

لەڕووی شێوەی چاوگ و پێوەندی بە بناغەی کاتی ڕانەبوردوو و رابردووی کاری سادەوە، کار دابەشدەکرێتە سەر ئەم بەشانەی خوارەوە:

یەکەم: ئەو چاوگانەی کۆتاییان بە ( ـ ان) هاتووە ئەمانەی خوارەوە دەگرنەوە:

أ) کاری ڕانەبوردوو ( بەشێوەیەکی سەرەکی)

**جوولان، ژاکان، ئێشان، گۆران، لەرزان، چەمان، چەرخان، لەوەران، ترسان، پەشۆکان، کولان، ڕژان، سووتان، شکان، مان و هی دی.**

ب) کاری ڕابوردوو کە ئەمانەی خوارەوەی لێ تێبینی دەکرێت:

**گێڕان، هێنان، کێشان، کێڵان، پەستان، پێچان، پێوان، شێلان، ویژان، وێژان، دان، نان و هی دی.**

پ) لە باری نادیاردا، کە ژمارەیان دیاری کراوە:

**بران، بڕان، دران، کران، کرانەوە، گیران، خران، شۆران، کوژران، نێژران، ووتران و** لەوانەیە هی دیش هەبێت[٢٣].

ئەم گروپەی لەمەوبەر باسکرا چەند تایبەتێتێکی لەبناغەی کاردا تێدا بەدی دەکرێت:

لە لقی ( أ ) دا رەگی کاری تێنەپەر لەکاتی ڕابوردوویدا کۆتایی بە ( ـ ا) دێت، بەڵام رەگی کاتی ڕانەبوردووی (ێ)یە: چەما ـ چەمێ (چەمان). تەنیا ئەم کارانەی

خوارەوەی لیٚ دەربچێت:

ا) کاری (مان)، کە لەکاتی ڕانەبوردوودا (ن) ی چاوگی دەپارێزێت و (ـ ا) دەبێت بە ( ـ یٚ): (ما، مێن).

ب) کاری (ژیان // ژین، گریان // گرین) دوو کاری کاتی ڕانەبوردوویان هەیە: ژییٚ // ژی، گرێی // گری.

پ) کاری (شیان) سیٚ کاری کاتی ڕانەبوردووی لیٚ دادەرێژرێت: شیٚ // شی// شییٚ.

ت) کاری (وەستان) رەگی کاری ڕانەبوردووی وەکو کاری ڕابوردوو دادەرێژرێت وەستا ـ وەست (بڕوانە باسی داهاتوو).

لە لکی (ب)دا، کە کارەکەی تێپەڕە، رەگی کاتی ڕابوردووی کۆتایی بە (ـ ا) دێت، بەڵام رەگی کاری رانەبوردووی تایبەتێتی لەنێوچوونی ئەم بزوێنەی هەیە: **پەستا ـ پەست (پەستان).**

ئەوانەی بەر ئەم یاسایە ناکەون:

أ) کاری نان و وێژان رەگی کاتی رانەبوردووی وەکو لکی ( أ)، کە کاری تێنەپەرە دادەرێژرێت: **نا / نیٚ، وێژا/ وێژیٚ (بڕوانە دارشتنی پێشوو).**

ب) کاری دان دوو رەگی کاتی ڕانەبوردووی هەیە ***دا / دە ، دا*** (شێوەی دا تەنیا بۆ کەسی سێیەمی تاك بەکاردێت).

کاری نادیاری لکی ( ب)یٚ هەروەکو بەشی تێنەپەڕ بەگۆڕینی ( ا) بە ( ب)ی دادەرێژرێت:

***کرا / کریٚ، ووترا / ووتریٚ.***

<u>دووەم:</u> ئەو چاوگانەی کۆتاییان بە ( ـ ین) هاتووە.

لەم بەشەشدا کاری تێپەڕ و تێنەپەڕ هاوبەشی دەکەن، کاری تێنەپەڕی ئەم جۆرە

لەڕووی داڕشتنی ڕەگییەوە هاوچەشنی کاری تێنەپەڕی کۆتایی هاتووی (ـ ان)ە.

أ) کاری تێپەڕ:

**دۆزین، چنین، گەزین، دۆشین، کڕین، کۆلین، مژین، برسین، زانین، بچڕین، سمین، ڕێسین، دزین، بەخشین، بڕین** و هی دی.

ب) کاری تێنەپەڕ:

**گرین // گریان، فڕین، گەفین، چەمین // چەمان، بارین، چەقین // چەقان، لەقین // لەقان، لەرزین // لەرزان، لەوەڕین // لەوەڕان، کۆکین، کۆخین // کۆخین ، نالین، ڕوانین، لەنگین ، پژین // پژان** و هی دی.

کاری تێپەڕ و تێنەپەڕی ئەم بەشەی سەروو تایبەتێتی هەبوونی بزوێنی ( ـ ی) لە کۆتایی ڕەگی کاتی ڕابوردوو و لەنێوچوونی ئەو بزوێنە لە ڕەگی کاتی ڕانەبوردوودا: دزی/ دو، چەقی / چەق و هی دی.

بەڵام ئەوانەی لەم یاسایە بەدەرن:

أ) کاری (مەیین)، کە کاری کاتی ڕانەبوردووی بە یارمەتی ێ: ی / ێ دەبێت: مەیی/ مەیێ. meyî / meyê ؛

ب) کاری (زایین) بەگۆڕینی (ا) بە (ێ) ڕەگی کاتی ڕانەبوردووی دادەڕێژرێت، هەر وەکو گروپی کاری ڕانەبوردووی چاوگی ( ـ ان).

<u>سێیەم:</u> ئەو کارانەی کۆتاییان بە (وون) هاتووە، کە چەند کارێك دەگرێتە خۆی.

۱) تێپەڕ:

**چوون، دروون، هەنوون، سوون، فەرموون.**

ب) تێنەپەڕ: چوون، بوون.

ڕەگی کاتی ڕابوردووی ئەم گروپەی سەرەوە کۆتایی بە (وو) هاتووە. ڕەگی کاتی ڕانەبوردووی دوو جۆرە: کاری تێپەڕی وەکو ڕەگی کاری ڕابوردووە: جوون ـ جوو ـ و

هەتا دوایی، بەڵام هی تێنەپەڕی لەگەڵ رەگی کاتی رابوردوو ریك دەکەوێت: چوون - چوو - چ، بوون - بوو - ب.

<u>چوارەم:</u> ئەو کارانەی کۆتاییان بە ( ـ تن) هاتووە، ئەوانیش برێتین لەتێپەڕ و تێنەپەڕ:

أ) تێپەڕ:

**ئاژۆتن، ئاخاوتن، بیستن، بزاوتن (لەگەڵ بزووتن ـ تێنەپەڕ بەراوردی بکە) دیتن، گرتن، هاویشتن، کوشتن، کرۆتن // کرۆشتن، ناشتن، ڕستن، رشتن، ویستن، ووتن، شتن // ششتن، هێشتن، بەستن[٢٤] و هی دی.**

ب) تێنەپەڕ:

**بزووتن، گەیشتن // گەیشتن، هاتن، نیشتن، پشکووتن، ڕۆیشتن // رۆیشتن، خەوتن // خەفتن و هی دی.**

رەگی کاتی رابوردووی ئەم بەشەی سەرەوە کۆتایی نەبزوێنی ( ـ ت) هاتووە، بەڵام لەکاتی ڕانەبوردوودا ئەم نەبزوێنە لەنێو دەچێت: کەوت ـ کەو (کەوتن)، گرت ـ گر (گرتن).

لەم بەشەدا کاری بەستن لە دارشتنی رەگی کاتی ڕانەبوردوویدا نەبزوێنی (ت) دەپارێزێت.

چەند کارێك هەن بۆ دارشتنی رەگی کاتی رانەبوردوویان (لەگەڵ لەنێوچوونی (ت)دا) ئەم گۆرینانەی خوارەوەش روودەدەن:

١ـ گۆرینی نەبزوینی رەگەکە، کە بەم شێوانەی خوارەوە دەبن:

آ) آ / ێ: ئاخاوت ـ ئاخێو (ئاخاوتن). هات ـ هـ (ێ) (هاتن)؛

ت) بزرۆکە (i) ێ: رست ( rist ) ـ رێس ( res ) (ڕستن) (لەگەڵ رێسین ـ رێس دا بەراوردی بکە.

پ) بزرۆکە (i) ۆ: شت (sit) ـ شۆ (شتن).

٢- گۆڕینی دەنگی وێکچوو:

آ) س - ز: خواست - خواز (خواستن)، گەست - گەز (گەستن)، قۆست - قۆز (قۆستنەوە).

ب) ش - ژ: چێشت - چێژ (چێشتن) // چەشت - چەژ (چەشتن)، کوشت - کوژ (کوشتن)، کرۆشت - کرۆژ (کرۆشتن).

پ) ش - ڵ: هێشت - هێڵ (هێشتن).

٣- گۆڕینی بزوێن و دەنگە نەبزوێنەکەی دوای ئەو پێکرا:

آ) آ - یَ و س - ز: پاراست - پارێز (پاراستن)، گواستن - گوێز (گواستنەوە).

ب) آ - یَ و ش - ژ: ناشت - نێژ (ناشتن).

ج) ی - یَ و ش - ژ: هاویشت - هاوێژ (هاویشتن)؛

ت) بزرۆکە ( **i**) - یَ و ش - ژ: ڕشت - ڕێژ (ڕشتن) (**ristin**).

٤- لەنێوچوونی (یش) لە ڕەگی کاردا:

گەیشت - گە (گا - بۆ کەسی سێیەمی تاك) (گەیشتن)، ڕۆیشت - ڕۆ (ڕوا - بۆ کەسی سێیەمی تاك) (ڕۆیشتن).

٥- لەنێوچوونی س (ش) لە ڕەگی کاردا و لەگەڵ گۆڕینی دەنگی بزوێنیدا: ویست - ویَ (ویستن)، بیست - بیێ (بیستن)، خست - خە (خا - بۆ کەسی سێیەمی تاك) خستن، شُشت - شۆ (شُشتن).

٦- کاری - ووتن و دیتن - ڕەگی ئەم هەردوو کارەکە لە کارەکە ناچن:

ووت - لیَ، دیت - بین.

**پێنجەم:**

ئەو بەشەی کۆتایی بە ( - دن) هاتووە و هەر کاری تێپەر دەگرێتەوە، تەنیا کاری (مردن) نەبێت، کە تێنەپەرە:

**بژاردن، بردن، چاندن، دەماندن، ژەندن، کەندن، کردن، ناردن، پەساردن، بواردن،**

ساندن // سەندن، سپاردن، خوێندن، خواردن هەتا دوایی.

ڕەگی کاتی ڕابردووی ئـەم گروپـە کۆتـایی بـەدەنگی (د) دێـت، بـەڵام ڕەگـی کـاتی ڕانەبردووی ئەم (د)یە لەنێو دەچێت: **مرد ـ مر ـ ژەند ـ ژەن.**

بەشی کاری ئـەم گروپـە لەدارشـتنی ڕەگـی کـاتی ڕانـەبردوودا دەنگـی بزوێنەکـەی دەگۆڕێت:

**ا ـ ێ: بژارد ـ بژێر، نارد، نێر، چاند ـ چێن.**

داڕشتنی ڕەگی کاتی ڕانەبوردوو لەکاری کـردن، بـردن، خـواردن دا لەگـەڵ گۆڕینـی بزوێنی ڕەگەکە و لەنێوچوونی (ر)ێ ، کە ڕەگی کاتی ڕابوردووە پێکدێت.

**کرد ـ کە (کا ـ بۆ کەسی سێیەمی تاك)، برد ـ بـە (بـا ـ بـۆ کەسی سـێیەمی تـاك)، خوارد ـ خۆ (خوا ـ بۆ کەسی سێیەمی تاك).**

**شەشەم:**

ئەو گروپەی کۆتایی بە ( ـ اندن) دێت دەگرێتەوە و کارەکانیشی تێپەڕن. ڕەگـی کـاتی ڕابوردووی پاشگری ( ـ اند)ی پێوەیە، ڕەگی کاتی ڕانەبوردووی کۆتایی بە پاشـگری ( ـ ێن) دێت:

**ڕژاندن ـ ڕژاند ـ ڕژێن.**

کاری ئەم بەشە لەڕووی پێکهاتنەوە دابەش دەکرێتەوە دوو بەش : ۱) ئەو بەشـەی لـە کـاری ڕانـەبوردوو (بەتایبـەتی ئەوانـەی کۆتاییـان بـە ـ ان، ـ ین و کـەمتریش ـ تـین هاتووە) پێك دێت[٣٥].

۲) لەناو داڕێژراوە (بەتایبەتی ئەو ناوانەی دەنگی سروشـتی دەردەبـرن) کـە لـەڕووی واتاوە تێنەپەڕن و لەڕووی شێوەش تێپەڕ.

آ) ئەو کارانەی بەر ئەو گروپە دەکەون و کاری تێنەپەرین بەرامبەر هەیە:

**ئاڵاندن ـ ئاڵان**

**بەزاندن ـ بەزین**

برژاندن ـ برژان

جوولاندن ـ جوولان

چەماندن ـ چەمین ـ چەمان

چوواندن ـ چوون

ئێشاندن ـ ئێشان

گەیاندن ـ گەیین // گەیشتن

گریاندن ـ گریان // گرین

ژیاندن ـ ژیان // ژین

لەقاندن ـ لەقان // لەقین

لەوەڕاندن ـ لەوەڕان // لەوەڕین

نەواندن ـ نەوین

نواندن ـ نوستن

سووتاندن ـ سووتان

شێواندن ـ شێوان

شکاندن ـ شکان

شڵەقاندن ـ شڵەقان

ترساندن ـ ترسان

خەفاندن ـ خەفین // خەفتن

خەڵەفاندن ـ خەڵەفان

خەملاندن ـ خەملان لەوانەیە هی دیش هەبێت.

هەروا کۆمەڵێکی دی کاری تێپەرش تێبینی دەکرێت، بەڵام لە بەرامبەریان کاری تێنەپەر نییە:

نوقاندن، نواندن، لاواندن، رەخساندن، سەلماندن، سەپاندن، رەتاندن، تەراندن،

تroووکاندن، تاواندن، خایاندن، خەساندن و لەوانە هی دیش هەبێت.

ب) ئەو کارانەی بەیارمەتی ناو دادەرێژرین:

| | |
|---|---|
| بالاندن | بالە |
| باقاندن | باقە |
| بۆڵاندن | بۆڵە |
| جیراندن | جیرە |
| جووکاندن | جووکە |
| چرپاندن | چرپە |
| فیکاندن // فیقاندن | فیکە // فیقە |
| گرماندن | گرمە |
| گیزاندن | گیزە |
| لووراندن | لوورە |
| میاواندن | میاو - میاو |
| ناڵاندن | ناڵە |
| نووکاندن | نووکە |
| نووزاندن | نووزە |
| پرخاندن | پرخە |
| پرماندن | پرمە |
| شریخاندن | شریخە |
| شیراندن | شیرە |

بەم جۆرە ئەو کارانەی کۆتاییان بە ( - اندن) هاتووە کاری تێپەر دەگرێتە خۆی، کە نیشانەی تێپەریی پاشگری ( - ان)ە. ئەم پاشگرە کاری تێنەپەر دەگۆرێت بە تێپەر

لەلایەك، لەلایەکی دییەوە لەگەڵ ناودا کاری تێپەر دادەرێژێت، هەروەکو نیشانەی نابیستریێن.

نادیاری (ـ ر) (تەماشای بابەتی جۆرەکانی کار و کاری نادیار بکە).

رەگی کار و پێوەندی بە جۆرەکانی کارەوە لەو نەخشەیەدا روون کراوەتەوە، کە لە کۆتایی بابەتی کاردا بڵاوکراوەتەوە.

پێشگری بـ // بـ و بزرۆکە ( bi ) بۆ دارشتنی دەمکاتی فەرمان و دەکاتی ئیلزامی بەکار دێن. ئەگەر کارەکە دارێژراو وەیا لێکدراو بوو ئەوا ئەم پێشگرە دەکەوێتە نێوانیانەوە وەیا هێندێك جار هەر لەنێو دەچێت و بەکارنایەت.

پێشگری (د)ە (کاتی) بۆ دارشتنی شێوەی کاری رانەبوردوو و داهاتوو و رابوردووی بەردەوامی بەکاردێت، کە لەکاری نەسادەدا دەکەوێتە نێوان پێشگر (ناو) و رەگی کارەوە[٣٦].

## پێشگری ناکردن

نا ـ بۆ دارشتنی شێوەی ناکراوی رانەبوردوو و داهاتووی ئیخباری بەکاردینت.

نە ـ بۆ داڕشتنی شێوەی ناکراوی رابوردووی ئیخباری و هەموو کاتەکانی دەمکاتی ئیلزامیش.

مە ـ بۆ دارشتنی شێوەی ناکراوی کاری فەرمان بەکاردێت.

نی ـ بۆ دارشتنی شێوەی ناکراوی کاری پێوەندی و کاری هەبوون.

### نیشانەی کەسی کار

دوو جۆرە نیشانەی کەسی کاری هەن.

جۆری یەکەمیان ( = کۆتایی کارن) و لەگەڵ گەردان کردنی کاردا بۆ هەموو کاتەکانی تێنەپەڕ و لەگەڵ تێپەڕی رانەبوردوو داهاتووش دا بەکاردێت، بەڵام جۆری دووەمیان ( = جێ ناوی لکاوی کەسی) لەگەڵ کاری رابوردووی تێپەڕدا بەکاردێت[٣٧].

### نیشانەی کەسی، کە لەگەڵ کاتی رانەبوردوودا بەکاردێت

آ) لەگەڵ رەگی کاری کۆتایی هاتوو بە نەبزوێن:

| تاک | | کۆ | |
|---|---|---|---|
| کەسی یەکەم | م ( im) | کەسی یەکەم | ین |
| کەسی دووەم | ی (ت) | کەسی دووەم | ن (in) |
| کەسی سێیەم | ێ (ت) | کەسی سێیەم | ن (in) |

ب) لەگەڵ رەگی کۆتایی هاتوو بە بزوێن:

تاك

| | |
|---|---|
| کەسی یەکەم | م |
| کەسی دووەم | ی (ت) // ( = ت) لەگەڵ رەگی کۆتایی هاتوو بە ( ـ ی) |
| کەسی سێیەم | ێ (ت) لەگەڵ رەگی کۆتایی هاتوو بە ( ـ وو) ا (ت) لەگەڵ رەگی کۆتایی هاتوو بە ( ـ ە) و ( ـ ۆ).<br>(ت) لەگەڵ رەگی کۆتایی هاتوو بە ( = ێ) و ( = ی). |

کۆ

| | |
|---|---|
| کەسی یەکەم | ین // ن لەگەڵ رەگی کۆتایی هاتوو بە ( ـ ی) |
| کەسی دووەم | بن // ن لەگەڵ رەگی کۆتایی هاتوو بە ( ن) |
| کەسی سێیەم | بن // ن لەگەڵ رەگی کۆتایی هاتوو بە ( ن) |

نیشانەی کەسی شێوەی دەمکاتی فەرمان بۆ تاك (ە // خال)ە لەگەڵ ئەو رەگەی کۆتایی بە بزوێن هاتووە)، بۆ کۆ (in // n )ە (لەگەڵ ئەو رەگەی کۆتایی بە بزوێن هاتووە).

## نیشانەی کەسی، کە لەگەڵ کاتی رابوردوودا بەکاردێت.

١ـ لەگەڵ کاری تێنەپەردا:

آ) لەگەڵ رەگی ئەو کارانەی کۆتاییان بە نەبزوێن هاتووە.

| تاك | | کۆ | |
|---|---|---|---|
| کەسی یەکەم | (im)م | کەسی یەکەم | ـ ین |
| کەسی دووەم | ی (ت) | کەسی دووەم | ن |
| کەسی سێیەم | خاڵ | کەسی سێیەم | ن |

ب) لەگەڵ رەگی کاری کۆتایی هاتوو بە بزوێن:

| تاك | | کۆ | |
|---|---|---|---|
| کەسی (١) | ـ م | کەسی (١) یان // ـ ن | |
| | | لەگەڵ رەگی کۆتایی هاتوو بە (ـ ی) | |
| کەسی (٢) | ـ ی (ت)//(ت) | کەسی (٢) | ـ ن |
| | | لەگەڵ رەگی کۆتایی هاتوو بە (ـ ی) | |
| کەسی (٣) | خاڵ | کەسی (٣) | ـ ن |

٢ـ کاری تێپەڕ

آ) لەگەڵ رەگی کاری کۆتایی هاتوو بە نەبزوێن:

| تاك | | کۆ | |
|---|---|---|---|
| کەسی (١) | م (im) | کەسی (١) | ـ مان |
| کەسی (٢) | ت (it) | کەسی (٢) | ـ تان |
| کەسی (٣) | ی (i) | کەسی (٣) | ـ یان |

ب) لەگەڵ رەگی کاری کۆتایی هاتوو بە بزوێن:

| تاك | | کۆ | |
|---|---|---|---|
| کەسی (١) | ـ م | کەسی (١) | مان |
| کەسی (٢) | ـ ت | کەسی (٢) | تان |
| کەسی (٣) | ـ ی (لە دوای<br>ـ ی / خاڵ دا) | کەسی (٣) | یان |

## پێوەندی کاری

پێوەندی کاری بۆ باری ئاسایی و ناکراوی شێوەکانی کاتی ڕانەبوردوو بەکاردێت.

لەباری ئاسایی پێوەندی لکاو ئەم دۆخە فۆنەتیکیەی خوارەی دەبێت:

آ) لەگەڵ رەگی کۆتایی هاتوو بە نەبزوێن:

| تاک | | کۆ | |
|---|---|---|---|
| کەسی (١) | - م (im) | کەسی (١) | - ین |
| کەسی (٢) | - ی (ت) | کەسی (٢) | ن (in) |
| کەسی (٣) | - ە | کەسی (٣) | ن (in) |

ب) لەگەڵ رەگی کۆتایی هاتوو بە بزوێن:

| تاک | | کۆ | |
|---|---|---|---|
| کەسی (١) | م | کەسی (١) | - ین // - ن لەگەڵ رەگی کۆتایی هاتوو بە - ی |
| کەسی (٢) | - ی// خاڵ لەگەڵ رەگی کۆتایی هاتوو بە ( - ی) | کەسی (٢) | - ن |
| کەسی (٣) | یە// - ە لەگەڵ رەگی کۆتایی هاتوو بە - وو | کەسی (٣) | - ن |

شێوەی ناکراوی بە سەربەخۆیی بەکاردێت.

| تاک | | کۆ | |
|---|---|---|---|
| کەسی (١) | نیم | کەسی (١) | نین |
| کەسی (٢) | نی (ت) | کەسی (٢) | نین |
| کەسی (٣) | نی‌یە | کەسی (٣) | نین |

پێوەندی کاری لە کاتی رابوردوودا ئەم جۆرە گەردان کردنەوەی خوارەوەی دەبێت لەگەڵ کاری (بوون) دا.

| شێوەی ئاسایی | | | شێوەی‌ناکراوی | | |
|---|---|---|---|---|---|
| کەس | تاك | کۆ | کەس | تاك | کۆ |
| ١ | بووم | بووین | ١ | نەبووم | نەبووین |
| ٢ | بووی (ت) | بوون | ٢ | نەبووی (ت) | نەبوون |
| ٣ | بوو | بوون | ٣ | نەبوو | نەبوون |

لێرەدا پێویستە تێبینی ئەوە بکرێت، کەوا ئەرکی (بـوون) لـە بوونـی دا بـە گـوزارە جیاوازە لەگەڵ بەکارهێنانەکانی دی دا.

١ـ وەکو کارێکی سەربەخۆ ئەم واتایانە دەبەخشێت[٣٩].

آ) هەبوونی شتێك وەیا کەسێك دەگەیەنێت:

ئەگێڕنەوە پاشایێك بووە، کوڕی هەبووە.

پیاوێك بوو، ناوی سلێمان بوو.

من لە سبەینێ لە خەستەخانە ئەبم.

ئەگەر تۆ نەبوویتایە من شەش مانگ لە بەغدا ئەبووم.

ب) خاوەنێتی:

خۆزگە منیش برایەکی وام بووایە.

کوڕێکم ئەبێ.

پاشا ئەمەی زۆر پێ خۆش ئەبێ، کە سێ بووکی وەهای ببێ.

لەم واتایەی‌دا کاری بوون و هەبوون هاو واتان[٤٠].

٢ـ لە دەوری کاری یارمەتیدەردا (بە لێکدانی لەگەل ئامرازی پێوەندی (بە) وەیا ئامرازی

لکاوی ( ـ ە) کە دەکەونە دوای کارەکەوە)[41]:

**ئەو بوو بە مرۆڤێکی چاك**

**لەگەڵ (ئەو مرۆڤێکی چاکە)دا بەراوردی بکە.**

**هەروا لەگەڵ ئەم رستەیەش دا:**

**ئەو مرۆڤێکی چاك بوو.**

٣ـ لە ئەرکی کاری یارمەتیدەردا لەگەڵ ناودا (لەم بەکارهێنانەدا بوون) پێوانـەی گـەردان کردنی خۆی بەتەواوی بەدیار دەخات)[42]:

**هەرکە لوولەیێکی ئەچوو، لوولەیێکی تر بە دوایا بەرز ئەبووەوە.**

**لەگەڵ ئەم ڕستەیەی خوارەوەدا بەراوردی بکە: ئەوی تریان باریکەلەیێکی بەرز بوو.**

٤ـ لـە ئـەرکی لەدەسـت دانی واتـــای راســتەقینەی خـۆی لەشـێوەی (ئـەبی، ئـەبوو، ئەبووایە)دا، کە مانای پێویستی دەبەخشێت:

**ئەبێ ئەم ئێوارەیە گەورەمان بکەی.**

**ئەبێ بووترێ.**

**ئەبووایە برۆشتایە و هی دی.**

## دارشتنی شێوەکانی کار

آ) ئەو شێوانەی لە رەگی کاتی رانەبوردوودا دارێژراون:

کاری رانەبوردوو و داهاتووی ئیخباری تێپەر و تێنەپەری بە پێش خستنی نیشانەی (د)ە بـە پێش بناخـەی کـاتی رانـــەبوردووەوە و پێـوە لکـانی نیشـانەی کەسـی بـە کۆتاییەوە[43]. لە دەمکاتی ناکراوی دا لە برێتی (د)ە نا بەپێش رەگەکەوە دەکەوێت.

بۆ پێشاندانی جۆری گەردان کردنی کاری رانەبوردوو (کەوتن) و کاری رابردوو گرتن بە وێنە هێندراوەتەوە:

| کەس | شێوەی ئاسایی تاك | شێوەی ئاسایی کۆ | شێوەی ناکراوی تاك | شێوەی ناکراوی کۆ |
|---|---|---|---|---|
| ١ | ئەکەوم | ئەکەوین | ناکەوم | ناکەوین |
| ٢ | ئەکەوی (ت) | ئەکەون | کەوی (ت) | ناکەون |
| ٣ | ئەکەوێ (ت) | ئەکەون | اکەوێ (ت) | ناکەون |
| | | | | |
| ١ | ئەگرم | ئەگرین | ناگرم | ناگرین |
| ٢ | ئەگری (ت) | ئەگرن | ناگری (ت) | ناگرن |
| ٣ | ئەگرێ (ت) | ئەگرن | ناگرێ (ت) | ناگرن |

ئەم شێوەیە لەوانەیە ئەم واتایانە ببەخشێت:

١) ڕوودان لە کاتی ڕانەبوردوودا بەشێوەیەکی گشتی.

٢) ڕوودان لەکاتی ئێستەدا.

٣) ڕوودانی دووبارە کراوە وەیا هەمیشەیی.

٤) ڕوودان لە داهاتوودا.

*وێنە:*

**ئەوە پیاوەکە ئەڵێت چی ؟**

**نایدەتێ ! بە زۆر لێت ئەسێنێ.**

**بەباڵی یەکێکی تر ئەفڕێ (پەند).**

**هەر جارێ کە خۆی هەوڵ ئەقوڵێنێ لە ئاوەکە یەکێ لە گرێکان ئەکاتەوە.**

شێوەی باسکراو باسی ڕووداوێك دەکات بۆ هەموو کاتێك بگەڕێتەوە ڕانەبوردووە،

داهاتوو وەیا رابوردوو:

**بەردی بچووك سەر ئەشكێنێ (پەند) ئەڵێن وا نی‌یە و هی دی.**

هێندێك جار شێوەی رانەبوردوو ـ داهاتوو بۆ پێشاندانی ڕوودان لە رابوردوودا بەكاردێت:

چەند مانگێك تێ ئەپەڕێت بەسەر گواستنەكەی بووكەكاندا، لەپڕ رۆژێ پادشا میوانێكی زۆری دێت.

بۆ بەخشینی واتای ڕوودانی ڕووداو لەكاتی قسەكردندا تیپی نیشانەی **ئەوا، وا** بەكار دێت، كە بەپێش كارەكە دەكەوێت:

كە ئەگاتە ئەوێ، ئەبینێ، ئەوا هەردوو خوشكەكەی لەخۆیان ئەدەن و ئەگرین.

رۆژێك ئەچێ بۆ لای گەنمەكەی، سەیر ئەكا وا لە نزیك گەنمەكەی ئەوەوە شوانێك خەریكە بلوێر لێ ئەدا.

تیپی نیشانەی ئەوا، وا لەگەڵ نیشانەی پێوەندی گوزارەیی كاتی رانەبوردوودا بەراورد بكە:

**كە ئەچووە ئەوێ، وا هەڵپەركێیە.**

ئەم دیاردەیەی پێشوو، كە تیپی نیشانەیی بۆ پێشاندانی واتای ڕووداو بەكاردێت لەكاتی قسەكردندا لەوانەیە بە شێوەیەك بێت نادیار بێت:

**ئەمەی پێ ناوێ، ئەوا برای خۆی لەگەڵە، با ئەو بیباتەوە.**

**كاكە ئەوا خورشە بە خۆی و دوو كەسی تر لە هاورێكانییەوە لەوێ دانیشتوون چا ئەخۆنەوە.**

بەكارهێنانی تیپی ئەوا، وا بۆ پێشان دانی ڕووداوی نیزیك و لەكاتی داهاتوودا دەبێت:

**برام شاهیدت بێنە ـ بەسەرچاو وا ئەچم بۆ شاهیدی.**

**بەڵام دوو ئاگا تازەم دەست كەوتووە، ئەوا ئەیانگێڕمەوە.**

بەم جۆرە تیپی نیشانەی ئەوا، ئەو بەهۆی دیاری کردنی نێوان رانەبوردوو رابوردوو لەلایەك وە نێزیکی ڕوودانی کات لە داهاتوودا لەلایەکی دی پێشان دەدات.

## کاتی رانەبوردوو و داهاتووی ئیلزامی

لە دانانی پێشگری (بـ ـ) لەپێش رەگی کاردا و پێوەلکانی نیشـانەی کەسـی جـۆری یەکەم بە کۆتایی رەگەوە، کە کاتی رانەبورددوە، بۆ دارشتنی شێوەی ناکراویشی (نە) شوێنی (بـ) دەگرێتەوە. سێیەم جـۆرە جیـاوازیی شـێوەی دارشـتنی کـاری رانـەبوردوو و داهاتووی دەمکاتی ئیخباری و ئیلزامی تەنیا لەپێشگرەکەی دایە. لە بـاری چەسـپیو و ناکراویدا:

| گەس | شێوەی ئاسایی<br>تاك | <br>کۆ | شێوەی ناکراوی<br>تاك | <br>کۆ |
|---|---|---|---|---|
| ١ | بکەوم | بکەوین | نەکەوم | نەکەوین |
| ٢ | بکەوی (ت) | بکەون | نەکەوی (ت) | نەکەون |
| ٣ | بکەوێ (ت) | بکەون | نەکەوێ (ت) | نەکەون |
| | | | | |
| ١ | بگرم | بگرین | نەگرم | نەگرین |
| ٢ | بگری (ت) | بگرن | نەگری (ت) | نەگرن |
| ٣ | بگرێ (ت) | بگرن | نەگرێ (ت) | نەگرن |

باری یەکەم لە ڕستەی سادە و نەسادەدا بەکاردێت کە واتـای جۆراوجـۆر و جیـاواز دەبەخشێت:

ئاوات، داخوازی، تیـان و مەبەسـت و هـی دی ئـەم واتایانـە وشـە و تیپـەکان پتـەوتر و بەدیارتر دەخەن:

**تۆ خۆت بچۆ بەڵکو چاوت پێی بکەوێت.**

**ناوێرم لەگەڵت بێم و پیشانت بدەم.**

لەو ڕستانەدا ، کە پرسیار و ئاوات و مەبەستی ڕووداو دەردەبڕن ، ئەم وشانە بەکارنایەن :

**وازم لێ بێنن، بیکەن بۆ خاتری خوا واز بێنن!**

**خوا گوێت لێ بگرێت.**

باری یەکەم لە ڕووی شێوەوە لەنێو ڕستەی شوێنکەوتوودا تێبینی دەکرێت:

١ـ مەرج و بار:

**کە تۆ ئیشێکم بۆ نەکەی بە کەلکی چی دێت.**

**کەڵەشێر لە ناوەختا بخوێنێ سەری خۆی ئەخوات.**

٢ـ ئامانج:

**هاتووین شەڕمان لەگەڵا بکەی.**

**با ڕفاندی بۆ ئەوەی بیهاوێژێتە ناو دەریا بێ بنەکەوە.**

٣ـ بەرکاری:

**زۆر حەز ئەکا ، کە بتبینێ و بتناسێ.**

**ئەیانەوێ سزای ئەوەم بدەن، کە بەم شەوە هاتوومەتە سەریان.**

٤ـ دیارخەری:

**ماڵ نییە نەیزانم.**

**شتی وەها گرنگ رووی نەداوە، کە بیکەیەنمە لای ئاغای خۆم.**

لەگەڵ ئەو وێنەیەدا بەراوردی بکە، کە لەباری یەکەمدا بەوێنە هێندرابۆوە و واتای چاوەڕێکردنی ڕوودان لەگەڵ ڕوودانی هەمیشەیی و دووبارە کراوی:

**قوتابی ژیر ئەوەیە، کە بەیانی زوو لە خەو هەڵبسێ، دەست و دەم و چاوی بشوا**

**سەری دابـهێنێ، ئینجا بچێتـە ژووری نـان خـواردن، جـوان نانەکـەی بخـوا.. و ڕوو لـە قوتابخانە بکا.**

٥ـ کات:

**هەتا تاڵی نەبینیت، خۆشی نابینیت (پەند).**

**خوا تا کێو نەبینێ بەفری تێ ناکات (پەند).**

٦ـ بـڕدەربرین (لەگـەڵ کـاری ڕابـردووی ئیلزامـی دا بـەکاردێت، ئـەو کارانـەی واتـای خۆیان لە دەستداوە):

**هەرچەند بیوستایە جنێو بە شارستانیەکان بدات، ئەیوت..**

٧ـ بەراوردکردن (لەگەڵ کاری ڕابوردووی ئیلزامی دا بەکاردێت):

**هەناسەیەکی دا وەکو بڵێت زۆر هیلاك بووم.**

**دەستێکی بە دەرگاکـەوە ووشـك بووبـوو، وەکـو ویسـتبێتی بیکاتـەوە و لـە مـەرگ ڕابکات.**

### دەمکاتی فەرمان

بە دانانی پێشگری ( بـ) لەپێش ڕەگی کاتی ئێستا (ڕانـەبوردوو) دادەڕێژرێـت و بـۆ ناکردنیشی پێشگری (مە) شوێنی ( بـ)[٤٤] دەگرێتە و نیشانەی کەسی ( ـ ە) وەیا هیـچ نیشانەیەك بە کۆتایی ئەو بناخەوە دەلکێـت کـە کۆتـایی بـە بزوێـن هـاتوو، بـۆ کەسـی دووەمی تاك و (ـ ن )یش بۆ کەسی دووەمی کۆ:

| کەس | باری چەسپیو |  | باری ناکراو |  |
|---|---|---|---|---|
|  | تاك | کۆ | تاك | کۆ |
| ١ | بکەوە | بکەون | مەکەوە | مەکەون |
| ٢ | بگرە | بگرن | مەگرە | مەگرن |

ئەم کارە فەرمانانەی خوارەوە لەم یاسایەی لەسەرەوە باسکراودا بەدەرن:

١ـ کاری چوون (چـ)[٤٥]. شێوەی کەسی دووەمی تاك (بچۆ)یە[٤٦] و کەسی دووەمی کۆی (بچن)ە.

٢ـ کاری هاتن (ێ)، کەسی دووەمی تاکی بەبێ پێشگری (بـ)ێ دادەڕێژرێت و شێوەی (وەرە)ی دەبێت و کەسی دووەمی کۆ (وەرن).

هاتن و هاتنەوە کاری فەرمانی لە دوو بناغەوە لێ دادەڕێژرێت ( ـ ێ، وەر)، بێرەوە[٤٧] بۆ کەسی دووەمی تاك و (وەرنەوە) بۆ کەسی دووەمی کۆ.

واتای فەرمان بەهۆی وشە و پیتی جۆرا و جۆریش دەردەبڕێت، وەك: دە، دەی، جا، فەرموو:

**دە هەستە بڕۆ، بچۆ بۆ سەر کاری خۆت.**

**ئا دەی ڕۆڵە بیگێڕەوە.**

**جا نامەکە بنێرە.**

**فەرموو دابنیشە**

**لە قسەم دەرمەچن ها.**

## شێوەی دارشتنی کار لە رەگی کاری کاتی ڕابوردووەوە

کاری رابردووی سادە لە رەگی کاری تێنەپەر و پێوەلکانی نیشانەی کەسی جۆری یەکەم دادەڕێژرێت بەڵام تێپەڕی نیشانەی کەسی جۆری دووەمی پێوە دەنووسێت[٤٨]، لە شێوەی ناکراوی کاری تێپەڕدا نیشانەی کەسی دەکەوێتە نێوان نیشانەی ناکردن و رەگی کارەوە.

| کەس | شێوەی ئاسایی | | شێوەی ناکراو | |
|---|---|---|---|---|
| | تاك | کۆ | تاك | کۆ |
| ١ | کەوتم | کەوتین | نەکەوتم | نەکەوتین |
| ٢ | کەوتی (ت) | کەوتن | نەکەوتی (ت) | نەکەوتن |
| ٣ | کەوت | کەوتن | نەکەوت | نەکەوتن |
| | | | | |
| ١ | گرتم | گرتمان | نەمگرت | نەمان گرت |
| ٢ | گرتت | گرتتان | نەتگرت | نەتان گرت |
| ٣ | گرتی | گرتیان | نەیگرت | نەیان گرت |

ئەم شێوەیە ڕووداو لە کاتی ڕابوردوویێکی ماوە کورتدا پێشان دەدات:

**لێشیان دام.**

**ژنەکە دەستی درێژ کرد لە تەنیشت مەنجەڵەکەوە.**

**قۆرییە گشت بە تەل پێچراوەکەی هەڵگرت و چایەکی بۆ تێکرد.**

**ئەمەی وت و هاتە دەرەوە و ڕۆیشت**

**ئەگەر ئەو ڕستەیەی ئەم شێوە کارەی تێدا قۆرییە گشت بە تەل پێچراوەکەی هەڵگرت و چایەکی بۆ تێکرد.**

**ئەمەی وت و هاتە دەرەوە و ڕۆیشت.**

ئەگەر ئەو ڕستەیەی ئەم شێوە کارەی تێدا بەکارهاتبوو و لەهەمان کاتیش دا کارەکە باری پێشاندا و وشەی ئاوەڵکاریشی لەگەڵدا بوو ئەوە کارەکە واتای ڕابوردوویەکی دووریش دەگەیەنێت، کە ڕووداوەکە تێیدا ڕوویداوە:

**چەند ڕۆژێك کوڕە بەم جۆرە دانیشت.**

**لەگەڵ ئەم ڕستەیەی خوارەوەی بەراوردبکە:**

**کوڕەکە لەبەر دەمییەوە دانیشت.**

**ئەوەندەمان یاریکرد تا ماندوو بووین.**

بۆ دەربڕینی ئەم واتایەی لەسەرەوە باسکراودا بەزۆری ئەو کارانە بەکاردێن، کە پاشگری ( ـ ەوە)یان پێوەلکاوە:

**هەرچەندە ژنە خۆی دا بە دار و دیوارا پارایەوە دڵ بۆی نەرم نەبوو.**

**تۆش هەر نەهاتیتەوە ئێمەش خەریك بووین بنووین.**

**مێردەکەی کەمێك لە کچێ وورد بۆوە.**

کاری رانەبوردوو لەگەڵ ڕستەی شوێنکەوتووی مەرج و کاتدا واتای کاتی داهاتوو دەبەخشێت.

**هەرکە گەیشتمێ پێت ئەنووسم.**

**پاش ئەوە کە گەڕاینەوە چی بکەین؟**

## کاری رابوردووی گێراوەیی

کاری رابوردووی گێراوەیی لە کاری رابوردووی سادە و بەپێش خستنی پێشگری (د)ە دادەرێژرێت. لەگەڵ کاری تێپەڕدا نیشانەی کەسی دەکەوێتە نێوان نیشانە و رەگی کارەوە:

| شێوەی ئاسایی | | | شێوەی ناکراوی | |
|---|---|---|---|---|
| کەس | تاك | کۆ | تاك | کۆ |
| ١ | ئەکەوتم | ئەکەوتین | نەئەوکەوتم | نەئەوکتین |
| ٢ | ئەکەوتی (ت) | ئەکەوتن | نەئەکەوتی (ت) | نەئەکەوتن |
| ٣ | ئەکەوت | ئەکەوتن | نەئەکەوت | نەئەکەوتن |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ١ | ئەمگرت | ئەمانگرتی | نەمگرت | نەمانگرت |
| ٢ | ئەتگرت | ئەتانگرت | نەتگرت | نەتانگرت |
| ٣ | ئەیگرت | ئەیانگرت | نەیگرت | نەیانگرت |

ئەم شێوەیە بۆ بەخشینی ئەم واتایانەی خوارەوە بەکاردێت:

١) دوور و درێژی روودان لە رابوردوودا:

**ئەو وەختە هەموو نووسراوێکم ئەخوێندەوە لەهیچی تێ نەئەگەیشتم.**

**کڵۆی بەفر ئەهاتە خوارەوە.**

**ئەرۆیشتم هەستم ئەکرد دڵم بەخێرایی لێ ئەدا.**

٢) دووبارەکردنەوەی رووداوێکی ئاسایی لەرابوردوودا:

**هەموو رۆژ بەیانیان زوو ئەهات و لە پشت مێزە شەق و شڕە شکاوەکەوە دائەنیشت.**

**هەرچەند باوکەکەی پێی ئەوت، هیچ ..**

٣) روودانی رووداوێکی نابەجێ لەرستەیەکی مەرجیدا:

آ) لەبەشی سەرەکیدا (لەشێوەی ئیلزامی ـ لەرستەی شوێنکەوتوودا):

**کتك باڵی ببوایە، تۆی چۆلەکەی ئەبڕی (پەند).**

ب) لەهەردوو بەشی ڕستەی تێکەڵدا:

**ئەگەر کەوڵ و پێست چاك ئەبوو بە شانی خاوەنی خۆیەوە ئەبوو (پەند).**

### کاری رابوردووی بەردەوامی

کاری تێنەپەڕی رابوردووی بەردەوامی لەناوی کراو و شێوەی پێوەندی کاری کەسی دادەرێژرێت، بەڵام تێپەڕی هەر لە ناوی کراو و پێوەلکانی جێ ناوی لکاوی جۆری

دووەم و لەگەڵ نیشانەی پێوەندی شێوەی کەسی سێیەمی تاك:

| کەس | باری چەسپیو<br>تاك | <br>کۆ | باری ناکراو<br>تاك | <br>کۆ |
|---|---|---|---|---|
| ١ | کەوتووم | کەوتووین | نەکەوتووم | نەکەوتووین |
| ٢ | کەوتووی(ت) | کەوتوون | نەکەوتووی(ت) | نەکەوتوون |
| ٣ | کەوتووە | کەوتوون | نەکەوتووە | نەکەوتوون |
| | | | | |
| ١ | گرتومە | گرتومانە | نەمگرتووە | نەمانگرتووە |
| ٢ | گرتووتە | گرتووتانە | نەتگرتووە | نەتانگرتووە |
| ٣ | گرتوویە(تی) | گرتوویانە | نەیگرتووە | نەیانگرتووە |

لەراستیدا کاری بەردەوامی ئەنجامی دۆخ وەیا ڕووداوێك لەکاتی قسەکردن دا دەست نیشان دەکات:

**ئەوە بۆچی بەم ئێوارەیە هاتووی ؟**

**شتێکم هێناوە.**

**من تا ئێستا هیچم نەکردووە.**

**هەموویان نووستوون کێ ڕێگام ئەکاتەوە؟**

لە دارشتنی کاری بەردەوامی بۆ پێشان دانی بارودۆخی ڕووداوێك لەکاتی قسەکردن دا زۆر جار پیتی ئاگاداری (ئەوا، وا) بەکاردێت:

**بەیانییەك کابرای هاورێ هاتە مزگەوت، سەیری کرد ئەوا ئەو زووتر هاتۆتە مزگەوتەکە**[٤٩].

لەداڕشتنی ئەو وێنانەی لە سەرەوەدا باسکران کاری رابوردووی بەردەوامی بۆی هەیە لەگەڵ شێوەی کاتی رانەبوردوودا لەیەك کات دا بەکاربێت:

**کچە ناوەندەکەش، کە ئەگاتە ئەوێ ئەبینێ ئەوا خوشکە گەورەکەی بەدیار کانییەکەوە دانیشتووە و ئەگری.**

## کاری رابوردووی دوور

بناغەی کاری رابردووی مەبەستدار لەگەڵ رەگی کاری رابوردووی بوون و نیشانەی کەسی جۆری یەکەم بۆ تێنەپەری و نیشانەی کەسی جۆری دووەمی بۆ تێپەری دادەرێژرێت:

| کەس | شێوەی چەسپیوو: تاك | کۆ | شێوەی ناکراو: تاك | کۆ |
|---|---|---|---|---|
| ١ | کەوتبووم | کەوتبووین | نەکەوتبووم | نەکەوتبووین |
| ٢ | کەوتبووی(ت) | کەوتبوون | نەکەوتبووی(ت) | نەکەوتبوون |
| ٣ | کەوتبوو | کەوتبوون | نەکەوتبوو | نەکەوتبوون |
| | | | | |
| ١ | گرتوویم | گرتبوومان | نەمگرتبوو | نەمانگرتبوو |
| ٢ | گرتبووی(ت) | گرتبووتان | نەتگرتبوو | نەتانگرتبوو |
| ٣ | گرتبووی | گرتبوویان | نەیگرتبوو | نەیانگرتبوو |

واتای بنجی رابوردووی دوور ـ کاتی دووری رووداو دەست نیشاندەکات:

لەتەنیشت هەر دەروازەیەك ژوورێکی دروست کردبوو، کووپە و گۆزە ئاوی ساردی تیا دانابوو. هێندێك جار بەدەگمەن تێبینی ئەوە دەکرێت کاری رابوردووی دوور

واتایەکی ڕوونەدراوی لەگەڵدا بگەیەندرێت:

**ئاخر باوکتم کوشتبوو، براتم کوشتبوو، تۆ چ رقێکت لەمن بوو بەم دەردەت بردم؟**

## کاری رابوردووی ئیلزامی

کاری رابوردووی ئیلزامی لەشێوەی کاری رابوردووی سادەدا دادەرێژرێت، ئەویش بەپێش خستنی پێشگری ( بـ ـ) و پێوەلکانی پاشگری ( ـ ایە). بۆ دارشتنی کاری تێپەڕ جێناوی لکاوی جۆری دووەم بە پێشگری (بـ ـ)وە دەلکێت و لە شێوەی ناکراویش دا بە (نا)وە دەلکێت:

| کەس | باری چەسپیوو | | باری ناکراو | |
|---|---|---|---|---|
| | تاك | كۆ | تاك | كۆ |
| ١ | بکەوتمایە | بکەوتینایە | نەکەوتمایە | نەکەوتینایە |
| ٢ | بکەوتیتایە | بکەوتیتایە | نەکەوتیتایە | نەکەوتایە |
| ٣ | بکەوتایە | بکەوتنایە | نەکەوتایە | نەکەوتنایە |
| ١ | بمگرتایە | بمانگرتایە | نەمگرتایە | نەمانگرتایە |
| ٢ | بتگرتایە | بتانگرتایە | نەتگرتایە | نەتانگرتایە |
| ٣ | بیگرتایە | بیانگرتایە | نەیگرتایە | نەیانگرتایە |

لەبەکارهێنانی کاری رابوردووی ئیلزامیدا ئەمانەی خوارەوە دەردەبرێن:

١ـ هیـواو ئـاواتی ڕوودانـی ڕووداو لەگـەڵ پێشـان دانـی بریـاری ڕوودان (کـەمتر راسـتی و بوونی ڕوودان)ی داخواز، ئەم واتایە وشەی (خۆزگە) و (بریا)ی لەگەڵ بەکاردێت:

**خۆزگە تۆپێکی وەهای ببوایە.**

**خالۆ، خۆزگە پێشانی زەڕنگەرێکت بدایە لە دێکەی خۆتان.**

**بریا من ببومایە بە مەلا.**

٢ـ پێویستی ڕوودانی ڕووداو لەگەڵ پێشان دانی توانای ڕوودان لە رابوردوودا (بە تایبەتی لەگەڵ وشەی ئەبوایە)[٥٠]:

**مامۆستای بەرێز ئەبووایە بینوسیایە مناڵە کوردەکان ئەبوایە بەو زمانە بیان خوێندایە.**

ئەم شێوەیە ئەم واتایانەی خوارەوە دەبەخشێت:

١) ڕوودانی ڕووداوی نابنجی و خۆزگەیی:

آ) لەنێو رستەی سەرەکی و ڕستەی شوێنکەوتوودا دەبێت:

خۆزگە بەڕەیەك جووتە جزمە و عەرەبانەیەك سووتومەنیم بووایە، جووان ئاگرێکم لێ بکردایەتەوە جزمەکانم لێ داکەنایە و لە سووچێکەوە بەڕەکەم لێ ڕاخستایە و بۆ خۆم ئاسوودە پاڵم لێ بدایاتەوە.

**دەبا باوکی دەوڵەمەند بووایە و تا تۆپێکی ئاوەهای بۆ بکریایە، بەڵام هەیهۆ..**

ب) لەبەشی ڕستەی شوێنکەوتووی مەرجدا (لە شێوەی کاری رابوردووی گێراوەییدا لە ڕستەی سەرەکیدا).

**کەچەڵ دەرمانکەر بووایە، دەرمانی سەری خۆی ئەکرد (پەند)**

**ئەگەر ئەو چاك بووایە، ئەمیش چاك ئەبوو.**

٢) ڕوودانی ڕووداوی واقیعی لە رابوردوودا:

١) لە رستەی شوێنکەوتووی مەرج و کاتیدا (لەشێوەی کاری رابوردووی گێڕاوەیی لە ڕستەی سەرەکیدا)

**هەرکە پیرێکی بدیایە ڕووی گرژ ئەکرد و دڵی ئەگیرا.**

**منالّە ووردکەی گەڕەکیش هەر دەریکەوتایە بەسەرییا دائەبارین.**

ب) لەبەشی ڕستەی شوێنکەوتووی مەرجدا (لە شێوەی کاری رابوردووی گێڕاوەیی ڕستەی سەرەکیدا).

**حەزیان لە هەرچی بکردایە، بەپارە لە باخەوانەکەیان ئەکری.**

**چاوی لەتۆپە نەئەتروکاند، بۆ هەرچی لا بڕۆیشتایە چاوی شوێنی ئەکەوت.**

## دەمکاتی کاری ئیلزامی دوور

دەمکاتی کاری ئیلزامی دووری تێنەپەڕ لە ڕەگی کاری ڕابردووی مەبەست و کاری ڕابوردووی بوون دادەڕێژرێت، بەڵام لە تێپەردا کاری بوون بۆ هەموو شێوەکانی هەر شێوەی کەسی سێیەمی تاکی هەیە، کە نیشانەی کەسی جۆری دووەم بە کۆتاییەوە دەلکێت:

| کەس | شێوەی چەسپیووی: تاك | شێوەی چەسپیووی: کۆ | شێوەی ناکراوی: تاك | شێوەی ناکراوی: کۆ |
|---|---|---|---|---|
| ١ | کەوتم | کەوتبین | نەکەوتبم | نەکەوتبین |
| ٢ | کەوتبی (ت) | کەوتبن | نەکەوتبی (ت) | نەکەوتبن |
| ٣ | کەوتبێ (ت) | کەوتبن | نەکەوتبێ (ت) | نەکەوتبن |
| | | | | |
| ١ | گرتبێتم | گرتبێتمان | نەمگرتبی (ت) | نەمانگرتبێ (ت) |
| ٢ | گرتبێتت | گرتبێتتان | نەتگرتبێ (ت) | نەتانگرتبێ (ت) |
| ٣ | گرتبێتی | گرتبیتیان | نەیگرتبێ (ت) | نەیانگرتبێ (ت) |

کاری ڕابوردووی ئیلزامی دوور بۆ بەخشینی واتای ڕەنگەی ڕوودانی ڕووداو بەکاردێت و وشەی (ڕەنگە، ئەشێ، ئەبێ)شی لەگەڵ دا بەکاردێت:

**ڕەنگە لە بوومەلەرزەکە زۆر ترسابێت و لەرزیبێت[٥١]**

**ڕەنگە لە ڕێگا نەخۆش کەوتبن.**

**ئەو پیاوە پیاوێکی ئازایە و ئەشێ تازە ڕووی کردبێتە ئەم شارە.**

**ئەبی تەماشایەکی ناو ئاشەکە بکەین، نەوەکو ئەمجارەش ئادەمزادێك خۆی تیا شاردبێتەوە.**

**ڕەنگە ئەم شاری سلێمانییە مزگەوتی زۆر تێدا بێت.**

کاری ئیلزامی دوور لەرستەی شوێنکەوتووی بەراوردکاری و مەرج دا زۆر تێبینی دەکرێت:

**هەناسەیەکی هەڵکێشا وەکو ئەم قسە دوورو درێژانە هیلاکی کردبێت.**

**ئەگەر خەبەرێکی وا ناخۆشی نووسیبێ ، هەڵبەت راستە.**

**ئەگەر پیاو لەو سەربانە بکەوێ ئەمرێ !**

**ئەگەر من کەوتبم نەمردبم.**

## خشتەی شێوەکانی کاری لەمەوبەر باسکراو

١) شێوە دارێژراو (لە رەگی کاتی رانەبوردوو)

| | تێپەڕ | تێنەپەڕ |
|---|---|---|
| ١ـ رانەبوردوو ـ داهاتووی کاری ئیخباری | ئەگرم | ئەکەوتم |
| ٢ـ کاری رابوردووی ئیلزامی سادە | بگرم | بکەوم |
| ٣ـ کاری فەرمان | بگرە | بکەوە |

ب) شێوەی دارێژراو (لە رەگی کاتی رابوردوو)

| | تێپەڕ | تێنەپەڕ |
|---|---|---|
| ١ـ کاری رابوردووی سادە | گرتم | کەوتم |
| ٢ـ کاری رابوردووی گێڕاوەیی | ئەمگرت | ئەکەوتم |
| ٣ـ کاری رابوردووی بەردەوامی | گرتوومە | کەوتووم |
| ٤ـ کاری رابوردووی دوور[٥٢] | گرتبووم | کەوتبووم |
| ٥ـ کاری رابوردووی ئیلزامی | بمگرتایە | بکەوتمایە[٥٣] |
| ٦ـ کاری رابوردووی ئیلزامی دوور | گرتبێتم | کەوتبم |

## کاری نادیار (بزر)

## (کاری کارا بزر)

بۆ داڕشتنی کاری نادیار نیشانەی (ـ ر)بە کۆتایی رەگی کاتی رانەبوردووی تێپـەڕدا دەلکێت و پاشگری (ـ ێ) بەم نیشانەوە دەنووسێت:

**نووسین ـ نووسرێ / نووسرا.**

**بەستن ـ بەسترێ / بەسترا.**

**نادرن ـ نێررێ / نێررا.**

**خەوتاندن ـ خەوتێنرێ / خەوتێنرا.**

لەو کارانەی پێرەوی ئەم جۆرە داڕشتنەی سەرەوە ناکەن:

١) کاری ویستن، بیستن، وتن، کـە شـێوەی نادیاریـان لـە رەگـی کـاتی رابـوردووەوە دادەرێژرێت:

**ویستن ـ ویسترێ / ویسترا**

**بیستن ـ بیسترێ / بیسترا**

**وتن ـ وترێ / وترا.**

ب) کاری خواستن و خوێندن

ـ شێوەی نادیاری ئەم دوو کارە لە رەگەکەیدا کاتی رابوردوو هەروا هی رانەبوردووش دادەرێژرێت:

**خواستن ـ خوازرێ / خوازرا**

**خواسترێ / خواسترا**

**خوێندن ـ خوێنرێ / خوێنرا**

**خوێندرێ / خوێندرا**

له دارشتنی شێوەی کاری نادیاردا ئەم گۆرینانەی خوارەوە لە رەگەکەیدا دەبێت:

١) گۆرینی بزوێنی (ە) بە بزرۆکە (i)

کردن kirdin ـ (کە) ـ کریێ / کرا

خستن xistin (خە) ـ خریێ / خرا

بردن birdin (بە) بریێ / برا

دان (دە) ـ دریێ / درا؛

٢) گۆرینی ( ـ یێ) بە ( i ) لە رەگدا :

نان (نیێ) ـ نریێ / نرا ؛

٣) گۆرینی ( i ) بە بزوێنی (ی):

گرتن (گر) ـ گیریێ / گیرا ؛

٤) گۆرینی بزوێنی (ۆ) بە (و):

خواردن (خۆ) ـ خوریێ / خورا ؛

٥) لەنێوچوونی نیشانەی بزری (ر) وەیا لێکدانی هەردوو (ر)ی بزری و (ڕ)ی بنجی رەگی کار:

گۆڕین (گۆڕ) ـ گۆریێ / گۆرا

لەگەڵ کرین (کر) ـ کڕرە و بڕین (بڕ) ـ بڕرێ / بڕرا دا لەرووی دیارنەبوونی (ـ ر)ێی بزری لەنێوانیاندا بەراورد بکە .

شێوەی شیکراوی نادیار لە کاری تێنەپەڕی کۆتایی هاتوو بە (ـ ان) (ـ یێ / ـ ا)ی جێی یەکتری دەگرنەوە (بڕوانە شێوەکانی کار و کاری رابوردووی ئیخباری و ئیلزامی).

هەروەکو لە کەرەستەکاندا دیارە باری نادیار بەشێوەیەکی گشتی لە شێوەی کەسی سێیەمی تاك و کۆدا زیاتر بەکاردێت.

| جۆرەکانی کار | ڕەگی کاتی ڕابوردوو | ڕەگی کاتی ڕانەبوردوو | کاری تێپەڕ و تێپەڕ و تێنەپەڕ | گۆڕینی دەنگی نێو ڕەگی کار |
|---|---|---|---|---|
| ١<br>ان | ا | ێ<br>خاڵ | تێنەپەڕ<br>تێپەڕ | ا - ێ<br>ا - ێ |
| ٢<br>- ین | ی | خاڵ | تێنەپەڕ<br>تێپەڕ | ی - ێ<br>ا - ێ |
| ٣<br>- وون | وو | خاڵ<br>وو | تێنەپەڕ<br>تێپەڕ | |
| ٤<br>- تن | ت | خاڵ | تێنەپەڕ<br>تێپەڕ | ا - ێ، ی - ێ<br>ا - ێ، ا - ە، ا - ۆ<br>س - ز، ش - ژ، ش - ڵ<br>س - ٠، ش - ٠، ش - ٠ |
| ٥<br>- دن | د | خاڵ | تێپەڕ | ا - ێ، ا - ە<br>وا - ۆ، وا، وێ |
| ٦<br>- اندن | اند | ێن | تێپەڕ | |

## تیپ

تیپی پرسیار کردن: ئایا، ئەی، ئەرێ.

<u>تیپی (ئایا)</u>: بۆ سەرنج ڕاکێشانی ئاساییە و هەر بۆ پرسیارکردنیش بەکاردێت؛ تیپی ئەی و ئەرێ بەکەمتر بۆ پرسیارکردن بە کاردێت:

**ئایا پێت ئەکرێ یاریدەمان بدەی؟**

**ئەی ئەمە چۆن بزانم؟**

**ئەرێ ئەم چرپە چرپەتان لە چییە؟**

**ئەرێ خوشکێ، ئەوە بۆ وا لەخۆت ئەکەی؟**

<u>**تیپی ئەرێ**</u>: بەڵێ، ئەرێ، ئا، با:

**ئەم کتێبە هی تۆیە؟ بەڵێ (هی منە)**

**ئایا باران ئەبارێ ؟ ئەرێ ئەباری.**

تیپی با هەمیشە بۆ وەڵامدانەوەی ئەرێ بەکاردێت:

**ئەمڕۆ ڕەشۆ نەچووە قوتابخانە ؟ ـ با.**

<u>**تیپی نەرێ**</u>: نا، نە[٥٤]، نەخێر:

**نا ، من داوای هەقی خۆم ئەکەم.**

**ئەی نەچوویت بۆ شار ؟ ـ نە .**

**نەخێر شتێکم هێناوە.**

<u>**تیپی نیشانەیی**</u>: ئەوا، وا، ئەوەتا // ئەوەتە ئەمەتا // ئەمەتە، ها ئەوە:

باوکم ئەوا ئەمە کوڕمە و ئەمەش برامە.

**وان لە کۆڵانا یاری ئەکەن.**

**ئەوەتا لەبەر پێتا.**

**ئەمەتەم لێرە، کوێریت نامبینی ؟!**

**نا ئەوە قاقەز و قەڵەم دانیشە و چی ئەزانی بنووسە.**

تیپی وا، ئەوا لەلێکدانی لەگەڵ ئامرازی لکاوی (ـ یش)دا گۆڕینێکی کاریگەر دەست نیشان دەکات:

**وا ڕۆژیش بەسەرچوو.**

**ئەوا بەهاریش بەسەرچوو.**

تیپی هێزداری ئەوە بەشێوەیەکی گشتی لە نێو ڕستەی پرسکردندا بەکاردێت و بۆ دەربرینی بەهێزتر و توندتری شێوەی پرسیارکردن دەور دەبینێت:

**ئەوە چۆن سەگتان کردۆتە ژووری مزگەوتەکە؟**

**ئەوە ئەڵێن چی؟**

<u>تیپی داخوازی:</u> دە، با

**دە بچۆ سەبەتەیەك کاشم بۆ بهێنە.**

**جارێ با تۆزێك دانیشین ـ باشە فەرموو با دانیشین !**

**تیپی جۆراوجۆر لەڕووی واتاوە:**

**خۆ، هەر، هەتا، ئاخر، جا:**

**خۆ هیچ ڕووی نەداوە؟**

**ئاخر ئەوەشم لەدەس دەرچێ، ئیتر چیم بۆ ئەمێنێتەوە لەم دونیایەدا ؟**

**هەتا منیش هاتم.**

**هەر ئەوەم ماوە.**

**جا کرێی شەمەندەفەرم لەکوێ بوو.**

## ئامراز

## ئامرازی لێکدەر

ئامرازی لێکدەری پێوەست: و(°°) (u//w ) (لەدوای ئەم وشانەی کۆتاییان بە بزوێن هاتووە) و(°°) ، ، هەم .. هەم، و ... و ، نە ... نە:

**ژنەکە ئەمەی وت و لێیدا ڕۆیشت.**

**بەختیار چوو زێڕەکانی کۆکردەوە و خستینە گیرفانیەوەو لەئاشەکە هاتە دەرەوە.**

**دەرسەکەم هەم خوێندەوە، هەم نووسیمەوە.**

**نەخۆی نە باوکیشی نازانن بەراستی تەمەنی چەندە.**

ئامرازی لکاوی (ـ یـ )ش لەوانەیە بەکاریشەوە بلکێت:

**باوکیان ئەشیخوارد و قسەشی ئەکرد.**

**ئامرازی لێکدەری جیاکەر:**

یا (ن)، یانەکو، یاخو، یا (ن).. (وە) .. یا (ن)

**بێم جلتان بۆ بشۆم یا نانتان بۆ بکەم؟**

**پیر یان لاو بوو.**

**ئامرازی لێکدەری پێچەوانە:**

بەلام، بەڵان، وەلێ، هەرچی، کەسێ، دەنا، ئەگینا:

**ویستی دەستەکەی بجوولێنێ، بەلام نەی توانی.**

**تەماشا باوکی تۆ چ ئاشێکی جووانی بۆ بەجێ هێشتوویت، کەچی باوکی من هیچی بۆ من جێ نەهێشتووە.**

**پارەکەم بدەرێ ، دەنا ئەڕۆم.**

ئامرازی لکاوی (ـ یـ )ش واتای دژ واتاش دەبەخشێت.

**من ئەرۆم، ئێوەش دانیشن.**

**ئامرازی گەیەنەر**

ئامرازی گەیەنەری دیارخەری: کە.

ئامرازی گەیەنەری کاتی: کە، (هـ) تا.

ئامرازی گەیەنەری هۆیی: چوونکە، لەبەر ئەوە (ئەمە) کە.

ئامرازی گەیەنەری ئامانجی: کە، تا.

ئامرازی گەیەنەری مەرجی: ئەگەر، کە

ئامرازی گەیەنەری پێچەوانە: هەرچەند (د).

ئامرازی گەیەنەری بەراوردکاری: وەکو، وەك.

دەربارەی بەکارهێنانی ئامرازی گەیەنەر، بروانە بابەتی رستەی تێکەڵ.

## تیپی بانـگـکردن

تیپی بانگکردن لەڕووی پێکـهاتنێوە لەیـەك وشـە (کـەمتر ـ لـە وشـەیەکی لێکـدراو) دادەڕێژرێت، و لەرووی واتاوەش ئەم جۆرانەی خوارەوەن:

١) کاریگەری جۆراوجۆر.

آ) خۆشی وشادی و بەختەوەری و سەرسوڕمان:

ئۆخ !، ئۆخەی !، ئۆخەیش، بەهـ، بەهـ، ئوف و هی دی.

ب) سەرسوڕمان

پەحـ // پەحا، پەك // پەکوو، حەی !، تەحـ // تەحا، ئای ـ یەی ـ یەی ! و هی دی.

پ) ژان و ئازار، ناخۆشی و خەم و پەژارە:

وەی، ئای، ئەی، ئەی ڕۆ ! ئەی هۆ !، ئۆف، داخ ! حەیف و هی دی.

ت) بێز لێ بوونەوە، لێ دوورکەوتنەوە:

جڕ !، بڤ // بڤە !، پووها !، کخ // کخە !، حەپە ! گزە گزە !، ترحێو! و هی دی.

ج) ڕاگەیاندن و ئاگادارکردن:

ئۆ !، های !، ئاها، و هی دی.

چ) هاندان:

دە ! ئێ // ئێی !، یەڵلا و هی دی.

٢) جۆرەهای بانگکردن، کە بۆ بانگکردن وەیا دوور خستنەوەی گیانلەبەران بەکاردێت:

ئە، وۆش، پش(ت) !، پس !، کوڕو ـ کوڕو، ئۆحە ! ، وهی دی.

لەئەرکی بانگکردن دا هێندێك وشە هەن، کە واتای تەواو دەبەخشن:

ئاه // ئاخ، ئاخ !، ئۆخ !، داخ، زۆرخۆش !، زینـهار ! هـەروا هێندێـك وشـەی دی هەن، کە لاسایی دەنگانن: گرمە، کشە، کشەکش، چوش، پڤ و هی دی.

## سینتاکس

سینتاکسی شـێوەی سلێمانی کۆمـەڵێك تایبـەتێتی خـۆی هەیە، کـە بـە هـەبوونی جێنـاوی لکـاوەوە پێوەسـتە، ئـەم جێناوانـەش دەورێکـی سـەرەکیان لەدروسـتبوونی ڕستەدا هەیە.

جێنـاوی لکـاو بەهــەمان شـێوەی خـۆی دەوری جۆراوجـۆری بەشــەکانی ڕسـتە دەگـێڕێت، وەك دیارخـەر و بـەرکاری ڕاسـتەوخۆ و تیـان. جێنـاوی لکـاو بەدانەیـەکی سـەربەخۆی واتـادار دەژمـێردرێت، هـەروا لەگـەڵ ئـامرازیش سـەربەخۆی واتـادار دەژمێردرێت، هـەروا لەگـەڵ ئـامرازیش دا لێکدەدات، بـە تایبـەتی لەرسـتەدا. ئەگـەر لەرستەیەکدا کۆمەڵێك جێناوی لکاو بەکارهات، ئەوا بەریز لەدوای یەك دێن.

جێناوی لکاو بەشێوەیەکی زۆر فراوان لەبرێتی نـاو بـەکاردێت و دەتوانێـت جێگـەی ئەو بگرێتەوە، بەتایبەتی لە دۆخی تیاندا.

جێنـاوی لکـاوی - ێ ، کـە کەسـێکی تایبـەتی پێشـان نـادات، دەورێکـی زۆری جۆراوجـۆری سینتاکسـی دەگـێڕێت و بـە ئامرازی پێوەندی وەیا کـار، یـان بــەرکاری تیانەوە دەلکێت، کە لە ڕسـتەدا دەوری جێنـاوی لکـاو وەیـا کۆتـایی کەسـی دەبینێـت. لەپاڵ دەوری پەرەسەندوی جێنـاوی لکـاو لـە سینتاکسـی شـێوەی سلێمانیدا ئـامرازی پێوەنــدی پاشکۆیەکانیشــی دەوری نیشــانەی ڕێزمــانی بــەرکار و ئاوەڵوشــەیکار (ئاوەلگوزارە) دەستنیشان دەکـات و دەورێکـی دیـاریکراوی سینتاکسـی خۆیـان هەیە، لەبەکارهاتنیدا لەدوای بەشەکانی ڕستەدا، کە تایبەتە بەشێوەی خواروی زمانی کوردی (لە بەراوردکردنیدا لەگەڵ شێوەی ژووروودا).

## رستەی سادە

رستەی سادە دابەشدەكرێتە سەر دوو بەشی سەرەكی: ڕستەی كاری و رستەی پێوەستدار، مەبەست لە ڕستەی كاری ئەو رستەیەیە، كە بەشی كاری برێتی دەبێت لە جۆرەكانی كار بە هەموو شێوەكانێوە، بەلام ڕستەی پێوەستدار لەناو و كاری یارمەتیدەر وەیا پێوەستدار پێك دێت.

## ڕستەی كاری

ڕستەی كاری لەڕووی واتای فەرهەنگی و تێپەڕ و تێنەپەڕی كارەكە دابەشدەكرێتەوە سەر ئەم بەشانەی خوارەوە:

١- ئەو دارشتنەی، كە وشەیكار (گوزارە) كەی برێتیە لەكاری تێنەپەڕی هەموو كاتەكان وەیا تێپەڕی كاتی ئێستە.

كاری بەشی وشەیكار (گوزارە) ی ئەم جۆرە دارشتنە لەڕووی كەس و ژمارەدا لەگەڵ بەشی سەركار (نیهاد) دا رێكدەكەوێت، بەركاریش یەكسەر دەكەوێتە دوای سەركارەوە.

**كچەكە دانیشت.**

**ئەو ئەنووسێ.**

**ئەو نامە ئەنووسی.**

لێرەدا لەكاتی بەردەوام بوونی قسەكردن دا سەركار (نیهاد) بۆی هەیە باس نەكرێت و ناوی نەهێندرێت و هەر تەنیا بگوترێت (ئەنووسێ، نامە ئەنووسێ).

٢- ئەو دارشتنەی، كە وشەیكارە (گوزارە) كەی برێتیە لە كاری رابوردووی تێپەڕ و جێناوی لكاوی لەگەڵ دا بەكاردێت، جێناوەكە بۆی هەیە بەهەموو بەشێكی رستەدا بلكێت (تەنیا نیهاد نەبێت). لەم جۆرە دارشتنەش دا بكەری ڕووداوەكە بۆ هەیە لە رستەكەدا نەبێت، چونكە دەربڕاوە.

**وێنەی ژمارە - ١ -**

بڕێتییە لە بکەری ڕووداو (سەرکار) و بەرکاری ڕاستەوخۆ جێناوی لکاو ، کە کەس و ژمارەی ڕووداوەکە پێشان دەدات (نیشانەی بکەرە) و لەگەڵ بەرکاری ڕاستەوخۆدا بەکاردێت.

**وێنەی ژمارە ١- أ -**

بەرکاری ڕاستەوخۆ، کە بڕێتی دەبێت لەناو (جێناو):

**من هەرگیز ماسیم نەخواردووە.**

**ژنەکەی ئەمەی ووت و دانیشت.**

لەباری هەبوونی بەرکاری ڕاستەوخۆدا نیشانەی ناسیاری بە دیارخەرەوە دەلکێت (ئەگەر ژمارەیان زۆر بوو ئەوا بە دیارخەری هەرە دواوە دەلکێت): پیرەمێردەکە هەناسەیەکی قووڵی درێژی هەڵکێشا.

**وێنەی ژمارە ١ - ب -**

ئەو دارشتنە دەگرێتەوە، کە بەرکاری ڕاستەوخۆ بڕێتی دەبێت لە کۆتایی کەسی جۆری یەکەم) ونیشانەی کەسی لەڕووی دارشتنی کاری بەشی وشەیکاری ئەم بارانەی خوارەوەی دەبێت:

١- لەگەڵ کاری سادەی بەشی وشەیکار:

أ) لەدوای بەرکاری ڕاستەوخۆدا دێت:

ئاوبردنی.

ب) بەبەشی ناکراویدا دەلکێت:

**باوکت لەکاتی خۆیدا نەی ناردی.**

پ) بەپێش بەرکاری ڕاستەوخۆدا دەکەوێت (بەڵام کەم بەکاردێت):

**ئێمە گرتمانن.**

٢- کەلەگەڵ وشەیکاری ناوی - کاریدا دەبێت، نیشانەی کەسی بەنیشانەی کارەوە وەیا بەبەشی ناوی وشەیکارەوە دەلکێت:

**لەولا دەریان کردووی.**

پیاوەکە پەلاماری دامێ، خستمی.

<u>**وێنەی ژمارە ـ ٢**</u>

برێتیە لەکەس وەیا بکەری ڕووداوەکە، هەروا بەرکاری ڕاستەوخۆو بەرکاری تیان بەهۆی کۆتایی بەرکاری ڕاستەوخۆ بەرکاری تیان بەهۆی کۆتایی ناوی وەیا کاری دەربراوە دارێژراوە.

<u>**وێنەی ژمارە ـ ٢ ـ أ**</u>

بەرکاری تیان برێتیە لەناو (جێناو)، کە لەدوای بەرکاری ڕاستوخۆدا دەبێت و نیشانەی کەسیشی پێوە دەلکێت:

**من تۆم بەبرای خۆم زانیوە.**

**پارەیەکی زۆری بۆ خاوەنی بردەوە.**

<u>**وێنەی ژمارە ٢ـ ب ـ**</u>

بەرکاری تیان ، کە برێتی دەبێت لە کۆتایی کەسی و بەهۆی ئامرازی پێوەندی (بۆ) وەیا (پێ) ڕێچکەکەی دەست نیشان دەکرێت:

أ) بە بەرکاری ڕاستەوخۆوە دەلکێت:

**ژنەکە گرتمۆڵکەیەکی بۆ فڕێ دام.**

**من سامانێکی زۆرم بۆ کۆکردوویتەوە.**

ب) بە ئامرازی پێوەندێوە دەلکێت:

**تەنیا دیاریم هۆنراوێکە بۆم هێناویت.**

<u>**وێنەی ژمارە ٢ ـ پ ـ**</u>

چۆن بەرکاری ڕاستەوخۆ لەکۆتایی کاردا دادەڕێژرێ، هەر بەم جۆرە بەرکاری تیانیش دەردەبرێت و نیشانەی کەسیش بەکۆتایی ئامرازی پێوەندیوە دەلکێت:

**خوا بۆی ناردومی .**

**خوا لێی سەندمی.**

**وێنەی ژمارە ـ ٣ ـ**

بکەری ڕووداوو بەرکاری تیان دەگرێتە خۆی، کە برێتی دەبن لەناو (جێناو)، کۆتایی کار.

**وێنەی ژمارە ٣ـ أ ـ**

برێتیە لە بەرکاری تیان، کە ناو وەیا جێناو دەوری ئەوی گێراوە و نیشانەی بکەریشی پێوەلکاوە:

**من لەو ماڵەم دزی.**

**لەهەزار ئاوی داوە، قوڵە پێی تەڕ نەبووە.**

**وێنەی ژمارە ٣ ـ ب**

برێتییە لە بەرکاری تیان، کە کۆتایی کار دەورەکەی گێراوە و نیشانەی کەسیش دووباری دیوە:

أ) لەگەڵ کاری سادەدا بەئامرازەوە دەلکێت:

**پیاوێك بۆی گێرامەوە.**

**پێم نەوتی ئەوە مەکە.**

ب) لەگەڵ ناوی لێکدراودا وەیا کاری دارێژراودا بەناوەوە وەیا پاشگرەوە دەلکێت:

**سەیرێکی کردم و وتی.**

**لێم پرسی.**

**زەفەری پێ بردم.**

**وێنەی ژمارە ٤**

برێتیە لە بکەری ڕووداو و ئاوەڵوشەیکارەوە ، کە نیشانەی کەسی بە کۆتاییەوە دەلکێت:

**پیاوە زۆری ووت، ژنەکە کەمی بیست.**

**ئەوەندەم قسەکرد.**

**وێنەی ژمارە ٥**

لەگەڵ ئەوەی کار هەر تەنێ بکەری ڕووداو دەردەبڕێت نیشانەی کەسی دەکەوێتە پێش کارەوە:

**پیاوەکە ئەشی خوارد و قسەشی ئەکرد.**

بەم جۆرە دارشتنی شێوەی دووەم لەدارشتنی شێوەی یەکەم دا جیا دەکرێتەوە:

أ) بەکارهاتنی جێناوی لکاو لەبرێتی نیشانەی کەسی کاردا.

ب) کۆتایی کار چۆن دەوری بەرکاری ڕاستەوخۆ دەگێرێت ئاواش دەوری بەرکاری تیان دەگێێت.

ئەم دوو جۆرە دارشتنە لەڕووی ئەرکەوە لێکدەچن و هەروا لەبواری واتاوەش زۆر کاریگەرن لەگەردان کردن دا هاو واتای کەسی بکەر دەست نیشان دەکەن دەوری سەرکار و بەرکاری ڕاستەوخۆ دەگێڕن بەوەی بەندیواریان دەمکاتەکانی کاردا هەبێت.

٣- دارشتنی تەواوکەری وەیا بەرکاری، کە وشەیکاری برێتیە لەکاری ڕابردووی تێپەڕ و پێوەندی نەك بە بکەر ، بەڵکو بە بەرکاری ڕووداوەکەوە هەیە.

ئەم جۆرە دارشتنە کەم بەکاردێت و بە شێوەیەکی سەرەکی لەگەل کاری کەسی سێیەمی کۆدا بەرچاودەکەوێت.

**پوور ئەستێش پەنجەکانی کردنە ناو ئاوەوە.**

**پەشکۆ هەردوو دەستی خستنە ژێر چەناگەی و کەوتە بیرکردنەوە.**

لەم جۆرە دارشتنانەدا بکەری ڕووداو (کە برێتیە لەجێناوی لکاو و بە بەرکارەوە لکاوە) بۆی هەیە دەرنەبرێت و لەنێوبچێت:

**شاهدی هێنان**

**بەنەهاتی سالێك دووانم لە منالەکانم ناشتن.**

**مۆمەکانی هاویشتنە سەر شەقام.**

ئەو بارەی لەوێنەی داهاتوودا بەرچاودەکەوێت ڕێککەوتنی نێوان کەس (بکەر) و بەرکارە لەیەك کاتدا:

**لەپاشا ڕووی لە ساواکە کرد و چەچەکانی گرتن و لەڕوووە لوێچاویەکەی لە چاو و نێو چاوانە گرژەکەی هەڵسووت و گواستیەوە سەر ریشە سپیەکەی و خستیە ناو دەمە بێ دانەکەی.**

لەم جۆرە دارشتنانەدا ئەوەی ئاشکرا و دیارە سیفاتی دیالێکتی خوارووی ، کە تێیدا هەیە لە (دارشتنی رستە لەگەڵ کاری رابردووی تێپەڕدا، کە کەس و ژمارەی بکەر بەهۆی جێناوی لکاوەوە دەربراوە) لەگەڵ تایبەتێتی بنچینەیی دیالێکتی ژووروو دا رێك دەکەون (لە دارشتنی رستەدا، کە وشەیکارەکەی کاری رابردووی تێپەڕە کەس و ژمارەی بەرکارە).

٤ـ دارشتنی خاوەنیەتی برێتیە لەو وشە لێکدراوانەی، کە یەکێك لەبەشەکانی (کە بە شێوەیەکی گشتی دەکەوێتە سەرەتای رستەوە) جێناوی کەسی دەبێت.

بەپێی ئەو جۆرە کارەی، کە لەم دارشتنانەدا هاوبەشی دەکات هەروا لەڕووی تایبەتێتی رێزمانی کارەکەوە ئەم پێك هاتنانە دابەش دەکرێتە سەر ئەم بەشانەی خوارەوە:

لەو دارشتنانەی، کە بەکاردێت ئەو دارشتنەیە، کە بکەر + جێناوی لکاو + کار لەباری ئاسایی شێوەی کەسی زۆر ێیەمی تاك لکاتی ئانەبردوو وەیا رابردوو دایە:

ئەم وێنەیەی سەرەوە پێوەندە بەجۆرەکانی کارەوە:

١) لەگەل هەبوونی کاردا:

**ئەم کوڕە منالێکی هەیە.**

**پادشا سێ کچی هەبوو.**

لەگەڵ هەبوونی دیاخەردا، کە لەدووای بەرکارەوە دێت جێناوی لکاو بە دیارخەرەکەوە دەلکێت:

**کابرای جۆلا ژنێکی جووانی هەبوو.**

هێندێك جار لەنێوان بکەر و بەرکاردا بەرکاری تیانیش بەکاردێت:

**دڵ بۆ دڵ رێگای هەیە (پەند).**

لەم جۆرە وێنانەدا ئەو جێناوە لکاوەی ، کە بکەرە بۆی هەیە لەنێو بچێت و بەرکارنەیەت.

**بەڵێ دوو شاهێدی هەیە.**

**بەلام کورێکی فیتنەم هەبوو.**

ئەم بەرکارەی، کە برێتیە لەجێناوی لکاو و لە رستەدا لەنێودەچێت، ئەوە بکەری رستەکە دەوری ئەویش پێشان دەدات و بەپێش کارەوە دەکەوێت (بەتایبەتی کاری هەبوون).

**بەڵێ من هەمە.**

**ئەویش هەیەتی.**

هەبوونی کار لەباری ناکراوی گشتیشدا لە رستەدا دەبێت:

**کورم هەبوو نەبوو بەتۆ چی ؟**

**ئەوانە لە هەوەڵەوە هیچ شتێکیان نەبوو.**

**ئێمەش نیمانە.**

٢) لەگەڵ کاری یارمەتیدەردا (کە لەگەڵ وشەیکاردا دێت و ناو، ئاوەڵناو ، جێناو و ئاوەڵکاریش)ی لەپاڵدا دەبێت:

**برام ناوی ئازادە.**

**من هیوام سەرکەوتنی تۆیە.**

**ئێوەماڵتان لەکوێیە؟**

لەگەل (ماڵتان لە کوێیە)دا بەراوردی بکە، کە (ئێوە)ی تێدا بەکار نەهاتووە.

وێنەی دیش بەرچاو دەکەوێت، کە ئامرازی رێچکە پێشان دەدات و (پێ) هاوبەشی بەشی وشەیکار دەکات:

**ئەوە تۆش لەتە کولێرەت پێیە ؟ بەڵێ**

**منیش هەر شتێکی وام پێیە.**

**کەس شتوومەکی قەدەغەکراوی پێ نییە؟!**

٣) لەگەل بارودۆخی کاردا:

**من سەرم ێشێ.**

**بۆ چی من سەرم سپی نەبووە، کەچی ڕیشم سپی بووە.**

**مرووەت لەشەرم کردن هەموو گیانی ئارەقی دەردا.**

لەم جۆرە دارشتنەش دا بکەر بۆی هەیە لابردرێت:

**سەرم ێشێ.**

**سەگیان خۆش ئەوێ.**

لەگەڵ هێندێک کاری تێنەپەڕدا، کە بەزۆری لەنێو تێکستی فۆلکلۆریدا بەرچاودەکەوێت، وەک: ژیان، مردن، کەوتن، گەیشتن، دەرپەڕین، تێ پەڕین:

**ئەمانەش زۆربەیان لەم سەردەمانەی دواییدا ژیاون.**

**پیاوێك برایەکی ئەمرێ.**

**تۆ تەمەنت لە هەشتا تێپەڕیوە.**

ئەم دارشتنە لەگەڵ کاری جۆراوجۆری دیش لە دەمکاتی ناکراودا بەرچاودەکەوێت:

**ئێمە لەم شەڕە هیچمان پێ ناکرێ.**

**مسگەر و ئاسنگەر بەبێ ئاگر هیچیان پێ ناکرێ.**

__وێنەی ژمارە - ٢ - أ-__

لەگەڵ بەرکاری تیاندا بەهۆی ئامرازی پێوەندێوە:

**من جلکم پی ناوێن .**

**یاپراخ دوگی ئەخەنە ناو.**

**ڕژدی ڕسوایی لەدوایە (پەند).**

لەوانەیە بەرکاری تیان بەهۆی ئامرازی پێوەندی و پاشبەندەکانێوە دارێژراو بێت:

**أ) ئەم شارە چەند نەخۆشخانەی تێدایە؟**

**ب) جۆگەیەك ئاوی تێدا بڕوا، زەحمەتە وشك ببێ.**

لەم رستانەی بەوێنە هێندراونەتەوە، ئەو بەرکارەی بریتیە لەجێناوی لکاو و بۆی هەیە لەنێو بچێت:

**گۆشتت پێوە نەماوە، کەچی دان ئەخەنە ئێسقانەکانت.**

**سەیری کرد سەد و چل لیرەی تیایە.**

**وێنەی ژمارە ـ ٢ ـ ب ـ**

بەرکاری تیان بەبێ یارمەتی ئامرازی پێوەندی (کەم بەرچاودەکەوێت):

**گۆم هەتا قووڵ بێت، مەلەی خۆشە.**

**رۆژێك پادشا میوانێکی زۆری دی.**

**وێنەی ژمارە ـ ٣ ـ**

جێناوی لکاو جێگری بەرکار دەبێت. ئەم دۆخە زۆر کەم بەکاردێت و لەگەڵ کاری رانەبردووی تێپەڕ و تێنەپەریش لەکاتی رابردوو و رانەبردوویدا:

**دۆ تا نەیژەنێ کەرە نادا (پەند)**

**باوکەی بەدرێژایی ژیانی چاوی پێی نەکەوتووە.**

**وێنەی ژمارە ـ ٤ ـ**

جێناوی لکاو جێگری وشەی ئاوەڵوشەیکاری دەبێت:

**با لێرە وچانێکی بۆ بدەین و نانی نێوەرۆی لێ بخۆین.**

ئەم دارشتنە جۆراوجۆرانەی لەمەوبەر بەوێنە هێندرانەوە، کە جێناوی لکاو جێگری چەند بەشێکی ڕستە دەبن، نیشانە و بەڵگەی ئەوەن، کە ئەم دارشتنە لە زمان دا بە هۆیەکی پێکهاتنی رستە دەژمێردرێت.

***٥ـ دارشتنی نادیار***

***وێنەی ژمارە ـ ١ ـ***

بریتیە لە بکەری ڕووداو (بەرکاری تیان)، کراوی ڕووداو (بەرکاری راستەوخۆ) لەگەڵ کاری وشەیکار لە دەمکاتی نادیاردا. ئەم جۆرە داڕشتنە دوو لایەنە، بکەری ڕووداو بە پێوەستەوە دەربراوە ـ لەناو (جێناوی کەسی) وەیا جێناوی لکاو.

*وێنەی ژمارە ـ ١ ـ أ ـ*

بکـەری ڕووداو برێتـی دەبێـت لـەناو (جێنـاوی) بـەهۆی ئـامرازی پێوەنـدی و پاشبەندەکەی (لەلایـەن .. ەوە) دادەرێژرێـت (بۆ پێشـان دانی کـەس)[٥٦] وەیـا بـە یارمەتی ئامرازی (بە)، (کە لەهەردوو واتایدا کەس و شت پێشـان دەدات) ڕووداو لەگـەڵ کاردا دەگونجێت:

**نامەکە لەلایەن خوشکمەوە ناردرا.**

**هەندێك لەوان لەلایەن دوژمنانی کوردەوە بڵاوکرانەوە.**

**من بەتۆ تێر ناکرێم.**

*وێنەی ژمارە ـ ١ ـ ب ـ*

بکـەری ڕووداو (بەشـێوەیەکی ئاسـایی کـەس) برێتـی دەبێت لـە جێنـاوی لکـاوی کەسی، کە بە کراوی ڕووداوەوە دەلکێت و ڕێچکەکەشی بەهۆی ئامرازی پێوەندی (پـێ) وەیا (بۆ)دا کە دەکەوێتە دایەوە پێشان دەدرێت. ئەم جـۆرە دارشـتنانە بـەزۆری لـەنێو تێکسـتی فۆلکلۆریـدا بەرچاودەکـەوێت، کـە دەکەونـە دوای کـاری رابـردووی و کەسـی رانەبردووی[٥٧] کەسی سێیەمی تاك بەگشتی:

**هیچی پێ ناخورێ**

**حەوشەکەیان پێ خاوێن نەکراوە.**

**نەخواردن و نوستنیشی بۆ ئەکرا.**

لێرەدا ئەو راستیە تێبینی دەکرێت و کەوا ئەو وشـەیکارانەی ، کـە برێتـین لـەکاری نـاکراو و واتـای نـەتوانایی و نـەبوونی و بێـهیوایی (دەبەخشـن، بکـەری ڕووداویـش ڕووندەکەنەوە).

*وێنەی ژمارە ـ ٢ ـ*

لەم بەشەدا بکەری ڕووداو دەرنابڕێت، بەڵام بەهۆی بەرکارەوە ئاشکرا دەکرێت، کە لەڕووی کەس و ژمارەوە لەگەڵ هەموو شێوەکانی کاردا ڕێك دەکەوێت، ئەم جۆرە دارشتنە لەچاو دارشتنەکانی باسکراودا بەزۆری بەکاردێت.

**کووپەڵە لەناو لقی دارەکەوە شاراوەتەوە.**

**لەپاش دا بووکەکان لە ماڵی جووتیارەوە ئەبرێنەوە ماڵی پاشا.**

لەم بارانەدا کراوی ڕووداو بەهۆی کارەوە بەدیاردەکەوێت، کە زۆر جار لە ڕستەدا لەنێو دەچێت.

**کە خوێندن تەواو ئەکات ئەکرێ بە مەلا**

*وێنەی ژمارە ـ ٣ ـ*

بڕێتیە لە کراوی ڕووداو کاری وشەیکاری کاتی ڕابردووی کەسی سێیەمی تاکە، کە دۆخی کراوەکە ڕوون دەکاتەوە، باوەکو ئەم دارشتنە بار و دۆخ پێشان دەدات، لەهەمان کاتدا واتای (دیتن)یش دەبەخشێت هەروا واتای جێناوی نیشانەییش:

تەماشای کرد تاکێکی قاپیەکەی پێوەدراوە، تاکێکی کراوەتەوە ئەمە بۆ کوژراوە.

*وێنەی ژمارە ـ ٤ ـ*

بڕێتیە لە بکەری ڕووداو و کاری وشەیکار و کە دۆخی بکەر پێشان دەدات، لەوانەیە بکەری ڕووداو کەس بەدیار بخات وەیا بەدیاری نەخات.

أ) بکەری دۆخی ـ کەس

لەم بارەدا وشەیکار بڕێتی دەبێت لە کارێکی لێکدراو (لە دەمکاتی ڕابردووی سادەدا) لەگەڵ بەشی ناودا، کە جێناوی لکاوی پێوە دەلکێت، ئەم جێناوە لکاوەش شوێنی بکەری ڕووداو دەگرێتەوە.

**من ئارامم لێ برا.**

**بەسێ زمانی بەسترا.**

ب ) بکەری - بێکەسی

وشـەیکارەکەی برێتیـە لـەکاری رانـەبردووی بـەردەوامی و هـەروا رابـردووی بەردەوامی و سادە:

**لاشەی یەك ـ دوو گورگ لەناو بەفرا لە خوێنا سوور ئەکران.**

**گەلای درەخت بەرەنیگێکی زەرد داپۆشریێ.**

*__وێنەی ژمارە ـ ٥ ـ__*

ئەم دارشتنە لەرووی پێکهاتنێوە بە جۆرەکانی ڕستەی بـێ بکـەری زمـانی ڕووسـی دەچێت. (مەبەسـت لەرسـتەی بێبکـەر لـەزمانی ڕووسـیدا ئـەو رستەیە، کـە شـێوەی وشەیکارەکەی کەس پێشان نادات ـ بروانـە فەرهـەنگی زاراوەی لینگویستیکی، لاپـەرە ٦٤ ـ وەرگێر).

لەرسـتەی تێکـەڵدا کـاری نادیـار چـۆن لـە رسـتەی سـەرەکیدا دەبێـت، ئـاواش کـە رستەی شوێنکەوتوودا دەبێت.

**بەڵام ئەوەندە هەیە ئەزانرێ ، کە وێژەی گەلی نەنوسـراوە فـرە کۆنـترە لـە وێـژەی نوسراو.**

**وێژەی گەلی ەو وێژەیە، کە دانەرەکەی نازانرێ کێیە.**

٢ـ لە رستەی ناکراودا:

**جگە لە ترووسکەیێکی کزی چرای مزگەوتەکەی گوند هیچ نەئەبینرا.**

٣ـ لـەو رسـتانەدا، کـە کـاری نادیاری وا دەربـراوە، کـە واتـای لینگویسـتی خـۆی لـە دەستداوە:

**هەتا پەرتووکیش ئەبێ حەشار بدرێت و بشاردرێتەوە.**

**پێویستە بوترێ.**

بەم جۆرە کاری نادیار لە زمانی کوردیدا لەڕووی تایبەتێتی دارشتنێوە زۆر بەکاردێت و پێك هێنانی واتای جۆراوجۆر هاوبەشی دەکات و بەتایبەتی لەو بارانەی لەمەوبەر باسکران.

## ڕستەی ناوی ـ کاری

مەبەشت لە ڕستەی ناوی ـ کاری ئەو ڕستەیە، کە بەشی وشەیکارەکەی بریتیە لە ناو و کارێکی یارمەتێدەر بە پێچەوانەی ڕستەی کاری، کە ڕووداو و دۆخ پێشاندەدات، بەڵام ڕستەی ناوی ـ کاری تەنیا دۆخی دەستنیشاندەکات. ئەم جۆرە ڕستەیە بکەری تێدا دەبێت وەیا لەوانەیە لە سەرەتای ڕستەدا وشەی بێ واتا وەیا ئامرازی (داخوازی و پرسیار و هی دی) بەرچاوبکەوێت.

ئەم جۆرە دابەشکردنەی بەشەکانی ڕستە، کە لەمەوبەر باسکران لە ڕستەی پرسیار کردنیش دا هەر هەمان شوێنیان هەیە، کە پرسیارەکە بەهۆی هێزەوە دەربڕاوە وەیا بەهۆی ئامرازی پرسیارکردنەوە، کە دەکەوێتە سەرەتای ڕستەوە لە پرسیارکردنێکی گشتیدا، بەڵام لەپرسیارکردنی تایبەتیدا بەزۆری دەکەوێتە پێش وشەیکارەوە.

## ڕستەی داخوازی

بەشێوەیەکی گشتی بەو وشانە دەست پێ دەکات، کە واتای خۆیان لەدەستداوە، هەروا بەپیت وەیا بە ئامرازی سەرسوڕمان دەست پێ دەکات، بۆ کاریگەری زێتر دەتواندرێت وشەیکارەکە لەسەرەتای ڕستەدا گۆبکرێت:

**چەند خۆشە ئەم گۆرانییە!**

**ئەمەیە سمیڵ !**

تایبەتێتی شوێنی وشە لەم ڕستەیەدا بەم جۆرەیە ، کە لەمەوبەر باسکرا، هەروا لەدارشتنیدا کە بەشەکانی ڕستە بریتی دەبن لەجێناوی لکاو لەنێودەچێت.

لەم رستانەی، کە بکەری تێدا دەبێت و لەرووی کەس و ژمارەدا لەگەڵ کاری یارمەتیدەر ڕێکدەکەوێت، واتای گشتی جۆراوجۆری پێشاندانی دۆخەکەی بەم شێوانەی خوارەوە دەبێت:

أ) واتای دۆخ بەخشین:

**من نەخۆشم.**

ب) واتای خاوەنێتی دەگەیەنێت:

**منیش نیمە.**

پ) واتای ڕێککەوتن دەبەخشێت:

**کاسەی پڕ ئاشتیی ماڵە (پەند).**

ت) واتای دۆخی شوێن دەبەخشێت:

**ئەویش ئێستا لەوێیە.**

ج) واتای خاوەنێتی دەگەیەنێت:

**ئەم کچە خوشکیانە.**

چ) مانای بەراوردکاری دەگەیەنێت:

**لەڕێوی بە پێچترە.**

لەو دارشتنانەی، کە جێناوی نیشانەی (ئەمە) وەیا (ئەوە) ی تێدا بەکاردێت، (بۆ پێشاندانی هەبوونی شتێك وەیا کەسێك لەنێزیکیدا لەکاتی باسکردندا) کاری یارمەتیدەر بەکارنایەت:

**ئەوە کاغەز و ئەوە پێنووس.**

**رستەی بێ بکەر**

برێتیە لەو رستەیەی، کە هەر تەنیا وشەیکاری هەیە، وشەیکارەکەش دوو بەشە: ناوی و کاری یارمەتیدەری کەسی سێیەمی تاك:

**نیوەڕۆیە، درەنگە.**

**شوێنی وشە لەنێو رستەدا:**

شوێنی ئاسایی وشە لەنێو رستەدا پێویستە بەو بەشانەیەوە، کە برێتین لـەجێناوی لکاو، کە بەم جۆرە دەبێت:

سـەرکار دەکەوێتـە سـەرەتای رسـتەوە، وشـەیکار لـەکۆتایی رسـتەدا دەبێـت، بەشـەکانی ناسـەرەکیش دەکەونـە نێـوان هـەردوو بەشـە سـەرەکێکەوە، لـەنێو بەشـە ناسەرەکێکانیشدا.بەرکاری راستەوخۆ دەکەوێتە پێش بەرکاری تیانەوە (لەهێندێك باردا بـەرکاری تیـان دەکەوێتـە دوای وشـەیکار) دیارخـەریش لەوانەیـە بـەپێش وەیا بـەپاش وشەیکارەکە بکەوێت، ئاوەڵوشەیکاریش دەکەوێتە پێش وشەیکار، تەنیا لەهێندێك باردا نەبێت، کە شوێن پێشان دەدات دەکەوێتە دوای وشەیکار.

رسـتەی لەسـەر شـێوازی دارشـتنی نادیـاریش دادادەرێژرێـت لەگـەڵ وشـەیکارێکی پەرەسەندووی بابەتەکەدا:

**ژنەکەت ناوی چییە ؟**

لەگەڵ

**(ناوی ژنەکەت چییە ؟)** دا بەراوردی بکە.

**کوڕەکانی کاتی ژن هێنانیان بووە.**

لەگەڵ

**(کاتی ژن هێنانی کوڕەکانی بووە)** دا بەراوردی بکە.

**حەوشەکەمان باخچەیەکی جوانی لێیە.**

لەگەڵ

**(باخچەیەکی جوان لە حەوشەوەکەمانا هەیە)** دا بەراوردی بکە.

## بەشەکانی ڕستە

**بەشەکانی سەرەکی ڕستە**

سەرکار بۆی هەیە برێتی بێت لە ناو (هەروا ئاوەڵناوی نـاوی کەسـی، نـاوی بکـەر و ناوی کرا و ژمارە)، چاوگ و جێناو:

**گوڵ بێ قنچك نابێ (پەند).**

**تا ژیر بیری کردەوە، شێت لەئاو پەڕیوە (پەند).**

**ڕۆیشتنم بۆ شار لەسەر تۆ وەستاوە.**

گوزارە: دوو جۆری، یەکێکیان برێتـی دەبێـت لـەکار و ئـەوی دییـان برێتـی دەبێـت لەکار و ناو.

لەرستەدا رێککەوتنی نێوان سـەرکار و وشـەیکار لـە رووی شـێوەوە بـیرەوە هەیـە، کەس و ژمارەیان لەگەڵ یەك گونجاون:

**پەرەسێلکەکان هەموو کۆچیان کرد.**

**براکەت لەوێیە.**

**ئێراویێ هەموو لێ ئەدەن ئەچن بۆ ماڵی کوێخا.**

لەگـەڵ ئـەوەش دا هێندێك جـار رێککـەوتنی نێـوان سـەرکار و وشــەیکار لــەڕووی شێوەوە (لەڕووی بیرەوە نا) تێك دەچێت بەتایبەتی لە کەسی سێیەمیدا.

١ـ سەرکار ـ شێوەی کەسی یەکەمی تاکی هەیە، بەڵام وشەیکار شێوەی کۆی هەیە:

أ) لەگەڵ ئەو سەرکارەی، کە برێتی دەبێت لە ناوێك، کۆ پێشاندەدات:

خەڵکی گەڕەك دێن و خۆیان ئەکەن بە ماڵی ئەحە ـ کوڵدا.

**منالّی هەژار زۆرن.**

**منالّەکان رۆیشتن.**

ب) لەگەڵ سەرکارێك ، کە برێتیە لە ژمارەی چەندی لەپاڵ نـاودا، ژمـارە (سـەد)ی لێ دەربچێت، کە وشەیکارەکەی هەمیشە تاك دەبێت.

**دوو خوشکە لەمە پەست ئەبن.**

سێ کابرا چوونە شار.

سەد جەردە لاتێك ڕووت ناکاتەوە.

ساڵی هەزاران فەرهادی تیا ئەمرێت.

پ) لەگەڵ سەرکارێك ، کە بریتیە لە لێکدراوی ناو لەگەڵ ئامرازی پێوەندی (لەگەڵ)دا، کە واتای ڕووداوی هاوبەش دەبەخشێت:

کچەکەش لەگەڵ هەردوو کوڕپەکەیدا لەشار ئەچنە دەرەوە.

ئەم ڕستەیەی خوارەوە لەگەڵ ڕستەی سەرەوەدا بەراورد بکە، کە کارەکەی شێوەی کەسی تاکی هەیە.

ت) لەگەڵ ڕێککەوتنی وشەیکاری بەرکاری تیانی لەگەل بەکارهاتوو لە دارشتنی کراو (بەرکار)ی دا.

٢ـ سەرکار شێوەی کۆی دەبێت و وشەیکاریش شێوەی تاك لە کاتێکدا، کە سەرکارەکە بریتی دەبێت لەناوێك جووت بەخش بێت وەیا واتای کۆ بگەیەنێت:

چاوەکانی وەك گۆماوی خوێن سوور هەڵگەرابوون.

لەگەڵ ئەم ڕستەیەی خوارەوەی بەراورد کە (چاوەکانی تاری بوو بوون) ، کە وشەیکارەکەی شێوەی کۆی هەیە.

پادشا، کە ئەمە ئەبیسێ مووەکانی وەك نەشتەر گرژ ئەبێ.

ئەم ڕستەیەی پێشوو لەگەڵ ئەو ڕستەیەی خوارەوە بەراورد بکە:

(مووەکانی وەك نەشتەر درێژ ئەبن)، کە وشەیکارەکەی لەشێوەی کۆ دایە.

٣ـ کاتێ، کە کۆمەڵێك سەرکار لەرستەیەکدا دەبن و لەڕووی ئەرکی سینتاکسێوە گونجاو دەبن و شێوەکەیان تاك دەبێت، ئەوا بەشێوەیەکی گشتی وشەیکارەکە لەباری کۆدا دەبێت:

ئێوارێ پادشا کوڕەکەی و دەست و پێوەندەکەی ڕوو ئەکەنە کۆشکەکە.

لەگەڵ ئەم ڕستەیەی خوارەوە بەراورد بکە:

(پاشا خۆی و دەست و پێوەندەکەی ئەچێ بۆ شکار) کە وشەیکاری رستەکە لەباری تاك دایە.

پێویستە تێبینی ئەوەش بکرێت، کەوا کاتێ سەرکار برێتی دەبێت لەناوی کۆی باری تاك، ئەوا وشەیکارەکەش شێوەی تاکی دەبێت:

**گەلای پایزمان زەرد بوو.**

**خوایە هەر منالە ووردەکە نەمبینێ.**

**بەرکار**

بەرکار چ راستەوخۆ بێت و چ تیان ئەوە بۆی هەیە برێتی بێت لە وشەی سەربەخۆی وەك (ناو، ئەو بەشانەی ئاخافتن، کە سەر بەناون و جێناو) هەروا جێناوی لکاو وەیا کۆتایی کار.

**بەرکاری راستەوخۆی برێتی لەوشەی سەربەخۆ**

ئەم جۆرە بەرکارە دەکەوێتە دوای سەرکار (گروپێك سەرکار) وەیا دەکەوێتە دوای وشەیکار. لەگەڵ ئەو وشەیکارەی، کە برێتی دەبێت لەکارێکی رابوردووی تێپەڕ ئەوە جێناوی لکاوی کەسی بەکۆتایی بەرکاری راستەوخۆوە دەلکێت، (ئەەر کەسی بە کۆتایی بەرکاری راستەوخۆوە دەلکێت، (ئەگەر زنجیرەیەك بەرکار یەك بەدوای یەکەوە هاتن، جێناوە لکاوە کەسێکە بە کۆتایی بەرکاری هەرە دوایی زنجیرەکەوە دەلکێت):

کابرا منالەکانی گرت و رۆیشت.

کوێر کوێر نابا بەرێوە

مامۆستا قەڵەمێك و پارچەیە کاغەزی بەدەستەوە گرت و وتی:

ئەگەر سەرکار بە وشەیەکی سەربەخۆ لەنێو رستەدا دەرنەبراوو ئەوە بەرکاری راستەوخۆ دەکەوێتە سەرەتای رستەوە(وەیا دەکەوێتە دوای ئاوەڵوشەیکارەوە).

**مەنجەڵەکە و کەوگیرم خستە قەرتاڵەکەوە .**

**هەموو ڕۆژ منالێکم ئەدی.**

## بەرکاری ڕاستەوخۆ بریتی لە جێناوی لکاو

ئەم جۆرە بەرکارە ئەم ئەرکانەی خوارەوەی هەیە:

***ئەرکی یەکەم - ا - لەگەڵ وشەیکاردا***

کە وشەیکار بریتـی دەبێت لـەکارێکی سادە، ئـەوە بەرکارەکـە بەپێشـگری کارەوەکـەوە دەلکێت:

**ئەبێ بچم و بیهێنم.**

**گەر سەگ نەبی، گورگ ئەتخوات (پەندە).**

**کەس نایان کرێ.**

***ئەرکی یەکەم - ا - ب - لەگەڵ وشەیکاردا***

کە وشەیکار بریتی دەبێت لەوشەیەکی لێکدراوی ناوی - کاری، ئەوە بەرکارەکـە بـە بەشی ناوەوە دەلکێت:

**ئەبێ بانگی بکەین.**

**برۆ، خوا ئاگادار بێت.**

***ئەرکی یەکەم - ا پ -***

لەگـەڵ وشـەیکاردا ، کـە وشـەیکارەکە بریتـی دەبێت لـــەکارێکی داڕێــژراو ئــەوە بەرکارەکە بە بەشی پێشگرەکەو دەلکێت:

**بەسە ! بەری دە !**

**برا گەورەی دەریان ئەکا.**

*ئەركی دووەم*

بەرکاری راستەوخۆ بە بەرکاری تیانەوە دەلکێت:

**بەڵام سەرت ڕووت کە، نەوەك لە دوورەوە بەمنت بزانن.**

*ئەركی سێ یەم*

بەرکاری راستەوخۆ بە ئاوەڵوشەیکارەوە دەلکێت:

**پێم بڵێ بە چەندیان ئەدەی.**

لێرەدا پێویستە تێبینی ئەو راستییە بکرێت، کەوا لەم ئەرکانەی لەمەوبەر باسکران، جێناوی لکاوی کەسی تێدا بۆتە بەرکاری راستەوخۆ، کاری دەمکاتی رانەبوردووە.

بەرکاری راستەوخۆ، کە برێتی دەبێت لەکۆتایی کار ، وشەیکار برێتی دەبێت لەکاری رابردووی تێپەڕ:

**بەجێمان هێشتن.**

**ئەمشەو خەوم پێوە دیویت.**

**لەولا دەریان کردووم.**

**نەیان برد.**

**جوان بەخێوی ئەکردین.**

رستەکانی بەوێنە هێندراونەتەوە ئەوە پێشان دەدەن، کەوا ئەرکی نیشانەی کەسی لەگەڵ بەرکاری راستوخۆدا بەپێی شێوەی کار و جۆری رستە دەگۆرێت.

**بەرکاری تیانی برێتی لە وشەی سەربەخۆ**

ئەم جۆرەیان بە یارمەتی ئامرازی پێوەندی و پاشبەندەکەی دادەرێژرێت و هەمیشە دەکەوێتە پێش وشەیکارەوە، کە دەکەوێتە پاش وشەیکار بەهۆی ئامرازی لکاوی

(ـ ە)ەوە دەبێت، بەرکار لەگەڵ ئەم چەشنە وشەیکارەدا رووگەی ڕووداو و شوێنی دەست پێکردنی ڕووداوەکە پێشان دەدات:

بەرکاری تیانی برێتی لەجێ ناوی لکاو بەهۆی ئامراز وەیا بەبێ هۆی ئامرازەوە دەبێت:

١ـ لەباری بەرکاری تیانی بەهۆی ئامرازەوە:

١) باری یەکەم.

بەرکار بەو ئامرازەوە دەلکێت، کە کەوتۆتە پێش وشەیکارەوە، وشەیکارەکەش بۆی هەیە برێتی بێت لەکاری تێپەر وەیا تێنەپەریش و هەر چ کاتێکیش بێت:

**هەر شتێکت ویست بۆت دێنم.**

**ئەوانیش پێی پێکەنین و چوون.**

**٢) باری دووەم**

بەرکاری تیان بە بەرکاری ڕاستەوخۆوە دەلکێت (وەیا بە دیارخەری بەرکارەکەوە)، بەڵام ئامرازەکەی دەکەوێتە دوایەوە و بەپێش گوزارەکەش دەکەوێت، وشەیکارەکە برێتی دەبێت لە کارێکی تێپەڕی ڕانەبردوو.

**باوڵەکەم بۆ بێنە.**

**ناتوانم چاومیان لێ بگوێزمەوە.**

**دەستە نوێنم لەم ژوورە بۆ دانێ.**

پێویستە سەرنج لە دەوری جێناوی لکاو بدرێت، کە دەبێتە بەرکاری تیان و بکەری ڕووداوەکەش لە ڕووی واتاوە لەو بارانەدا ڕوون دەکاتەوە، کە کارەکەی نادیار دەبێت.

***٢ـ باری دووەم***

بەرکاری تیان بەبێ ئامرازی پێوەندی

١) لەگەڵ وشەیکاردا ، کە وشەیکارەکە برێتی دەبێت لە کاری ڕانەبوردووی تێپەڕ.

ا ـ أ ـ

لەگەڵ ئەو وشەیکارەی ، کە برێتیە لە کارێکی سادە (هەمیشە ئەو کارانەی کە ڕێچکەی ڕوودانی ڕووداو پێشان دەدەن جێناوی لکاوی ( ـ ێ)ی لەگەڵ دا دێت) بەرکاری تیان بە کۆتایی نیشانەی کاری ڕانەبوردووەوە دەلکێت.

**من ئەتدەمێ (ئەت ـ دەمێ)**

**ئیتر بۆ بیپەرستم.**

ا ـ ب ـ

لەگەل ئەو وشەیکارەیە، کە برێتیە لەکارێکی لێکدراوی ناوی ـ کاری بەرکارە تیانەکە بە کۆتایی بەشی ناوی وشەیکارەکەوە دەلکێت:

**کوڕەکانمان خزمەتمان ئەکەن.**

**منیش یاریدەی ئەدەم.**

١ ـ أ ـ پ

لەگەڵ ئەو وشەیکارەی، کە برێتیە لە کارێکی دارێژراو، بەرکاری تیان بە کۆتایی پێشگرەکەوە دەلکێت:

**لێی ئەسێنم.**

ا ـ ت ـ

لەگەڵ ئەو وشەیکارەی ، کە برێتیە لە بەشێکی دارێژراو ، بەرکارە تیانەکە دەکەوێتە دوای بەشە بنجێکە:

**ئەوە چیتانە ؟**

**چۆن چیمانە ؟**

*باری دووەم*

بە بەرکاری ڕاستەوخۆوە دەلکێت:

**تۆ منی بدەرێ.**

له رستەی دووەمدا بەرکاری تیان بە دیارخەرەوە لکاوە، کە ئەویش هەر برێتیە لە جێناوی لکاو.

*باری سێیەم*

بەرکاری تیان بە وشەی ئاوەڵوشەیکارەوە دەلکێت (هێندێك جار ئەو بارە لەو کاتەدا دەبێت، کە وشەیکار لەنێو رستەکەدا نەهاتووە):

**ئەچم بزانم شتێکم ناداتێ بۆ زستانەکەمان.**

**ئەمە بۆ ئێوارێتان.**

## ئەو بەرکاری تیانەی، کە لە کۆتایی کاردا دارێژراوە

لەو بارەی، کە وشەیکار برێتی دەبێت لەکارێکی تێپەڕی رابردوو، ئامرازێکی پێوەندی بەپێش دەکەوێت و جێناوی لکاوی بکەری پێوەدەلکێت (لەو کاتەدا، کە بەرکاری راستەوخۆ لەنێو رستەکەدا نابێت):

**زەفەری پێ بردم.**

**دەمێکی هیچ دەنگ و باسێکت بۆ نەگێڕاومەتەوە.**

**پێم ووتی.**

**پێی ووتن.**

ئەم وێنانەی ژووروو لەگەڵ ئەم وێنانەی ژێروو بەراورد بکە، لە دەوری بەرکاری تیان دا لە برێتی نیشانەی کەسی جێناوی لکاوی کەسی بەکارهاتوون.

**ئەوە بۆ دەمێکە دەنگ و باسێکت بۆ من نەگێڕاوەتەوە.**

**دیارخەر**

دیارخەریش بۆی هەیە برێتی بێت لەوشەی سەربەخۆ وەیا جێناوی لکاو.

له وشەی لێکدراوی دیارخەریدا دیارخەر دەکەیوَتە دوای ناوی دیارخراوەوە، بەڵام لەباری دیدا بەپێش دەکەوێت.

ئەو دیارخەرەی دەکەوێتە پاش ناوی دیارخراوەوە بریتی دەبێت لە ئاوەڵناوی، ناوی بکەر و ناوی کراو، ناو، ژمارە و جێناوی (کەسی، خۆیی، پرسیار و دیار) هەروا جێناوی لکاو.

ئەو دیارخەرەی بەپاش دیارخراوەوە دەکەوێت (تەنیا ئەوەی بریتی دەبێت لە جێناوی لکاو) بەهۆی نیشانەی ( ـ ی) و ( ـ ە)ی خستنە سەرەوە دەخرێتە سەر ناوی دیارخراوەوە و دوو جۆرە دارشتنی دیارخەری پێك دەهێنن چۆنی و هەبوونی.

کە جێ ناوی لکاو دەوری دیارخەر دەگێرێت، بەهۆی هیچ ئامرازێکەوە بەناوی دیارخراوەوە ناڵکێت ( لەکاتێك دا، کە دیارخەری دی لەنێو رستەکەدا نەبێت) لەوانەیە جێناوی لکاوی کەسی وەیا جێناوێك، کە دەوری بەرکاری تیان بگێرێت بەم جۆرە دیارخەرەوە بلکێت:

**خوشکەکەتانم داوە بە کوڕی پاشای ئەم مەملەکەتە عەزیمە.**

**بەیانی من ڕێگای براکانمت پێشان ئەدەم.**

لەباری هەبوونی چەند دیارخەرێکدا، کە هەر یەکەیان بریتین لە وشەی جیا جیا جێناوی لکاو لەنێودەچێت:

**نیشانەی کامەرانییەکی بێ پایان لەسەر ڕووە گەرداوێکەیان دووبارە بۆوە.**

**ئەی گوێت لە قسەکانی باوکم نەبوو.**

دیارخەر، کە دەکەوێتە پێش ناوی دیارخراوەوە بریتی لە ئاوەڵناوی پلەی باڵا و ژمارە و جێناوی نیشانەی و ناکرا و و دیار و پرسیار.

## ئاوەڵوشەیکار

ئاوەڵوشەیکاری کات، شوێن، چۆنیەتی، مەبەست، هۆ و پێوان بریتی دەبن لە بەشەکانی جۆراوجۆری ئاخاوتن، وەك ئاوەڵکار، ناو، ئاوەڵناوی، جێناو و ژمارە

بەهاوکاری لەگەڵ ئامرازی پێوەندی وەیا ئامرازی پێوەندی و پاشکۆکانی ، یان هەر بەشەکانی ئاخاوتن بەسەربەخۆیی.

ئەو ئاوەڵوشەیکارەی لە جێناوی لکاو و ئامرازی پێوەندی و پاشکۆکانی پێکهاتوون جۆراوجۆرن.

**با لێرە ووچانێکی بۆ بدەین و نانی نیوەڕۆی لێ بخوێن.**

**بۆ ئەوەی ئەو شێوەی تیا حەل کا چووە ناوەیەوە. گەیشتنە دوو ڕێبانەیەک کانی و ئاوێکی لێ بوو.**

**وێنەیەکی گەورەی پێوە هەڵواسرابوو.**

## ڕستەی نەسادە

ڕستەی نەسادە دابەش دەکرێتە سەر دوو بەش بنچینەیی:

لێکدراو و تێکەڵ، کە بەهۆی ئامراز وەیا بەبێ ئامراز بەیەکەوە دەبەسترێن.

## ڕستەی لێکدراو

ڕستەی لێکدراو بەهۆی ئامرازی لێکدانی بەشەکانیەوە دابەش دەکرێتە سەر ڕستەی لێکدراوی پێوەیست، ڕستەی لێکدراوی پێچەوانەوە و ڕستەی لیکدراوی جیاکەر.

ڕستەی لێکدراوی پێوەست بەهۆی ئامرازی (و) و (وە) و (ی)ش بەشەکانی لێک دەدرێن:

ئێوارە دادێ و هەموو لێ ئەدەن ئەچن بۆ ماڵی باوکی. دەستمان کرد بە قسەکردن و پێی ووتن. هەر لەو ڕۆژەوە دڵیان بە یەکداچوو، مام ڕۆستەمیش هەموو جار بیانوویك ئەدۆزییەوە بۆ لادان.

ڕستەی لێکدراوی پێوەست بەبی ئامرازی پێوەستەوەش دادەڕێژرێت:

**بزنەکەمان بزر بووە، چووە بیهێنێتەوە.**

**مەولوو گەورە بووە کات هاتووە بیر لە ژن هێنانی بکەینەوە.**

### ڕستەی لێکدراوی جیاکەر

ئەم جۆرە ڕستەیە بەیارمەتی ئامرازی (یا)ن .. (یا) ن وەیا هەر (یا)ن دادەڕێژرێت:

هەر خۆت ئەچی، یا کەست لەگەڵە، یان دێیت لەگەڵما ئیش ئەکات، یا دەری ئەکەم.

### ڕستەی لێکدراوی پێچەوانە

ڕستەی لێکدراوی پێچەوانە بە یارمەتی ئامرازی بەڵام // بەڵان، دەنا، کەچی، ئەگینا لێکدەدرێت :

**ئەزانم ناتوانم شان بدەم لەشانی، بەڵام زەوی هی منە.**

**ئەوانەم بدەرێ، دەنا دەڕۆم.**

**لێرەدا وەستاو بە هێواشی چایەکی تێکرد و هەرچی منم تاسە ئەیبردمەوە.**

**تەماشا، کچی تۆ چ کەمەرێکی جوانی بۆ هێناویت، کەچی کچی من هیچی بۆ نەهێناوم.**

**دایکیان دایە قاقای پێکەنین و ئەمانیش دەسیان کرد بەگریان.**

## ڕستەی تێکەڵ

بەشەکانی ڕستەی تێکەل بەهۆی ئامراز و وشەی پێوەندێوە بەیەکەوە دەبەسترێن، لەوانەیە بەبی ئامرازیش لێك بدرێن، ڕستەی شوێنکەوتوو لەنێو ڕستەی تێکەڵدا باری جۆراوجۆری دەبێت بەرامبەر بە ڕستەی سەرەکی.

## ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری

ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری تێکەڵ بەڕستەی سەرەکێوە دەبێت بەهۆی ئامرازی گەیەنەری ( ـ کە) وەیا بەبێ ئەم ئامرازە. ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری دەکەوێتە دوای ڕستەی سەرەکێوە وەیا دەکەوێتە ناو ڕستەی سەرەکێوە لێرەدا وشەی دیارخراو بەهۆی ئامرازی ( ـ ی) خستنەسەرەوە بە ڕستەی شوێنکەوتووەوە لێکدەدرێت و هەمیشەش لەباری ناسیاریدا دەبێت.

ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بە شێوەیەکی گشتی دەکەوێتە دوای ڕستەی سەرەکێوە، بەڵام نەک هەمیشە.

**چاوی لە جۆگە کانیاوەکە بڕیبوو.**

**کە لەو کاتەدا لەبەر تیشکی مانگ دا ئەبریسکایەوە.**

**ئەو چاوە کوێر بێ، کە خەنیمی خۆی نەناسێ.**

**ژنەکەی چاو ئەبرێتەوە ئەو ڕێگەیەی، کە لە شارەوە دێتە دەرەوە.**

کە ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری دەکەوێتە نێو ڕستەی سەرەکێوە، لەدوای ناوی دیارخراوەوە دەبێت:

**ئەو پیاوەی، کە لەگەڵیا ئەدوام، باوکم بوو.**

**ئەو نامەیەی، کە هێناوتە بۆ حوکمدار ئەبی خۆت بۆی ببەی.**

زۆرجار ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بەبێ ئامرازیش بەرچاو دەکەوێت و هەمان دارشتنی خۆشی دەپارێزرێت، کە لەگەڵ ئامرازدا دەبێت بەڵام لەباری بەکارهاتنی ئامرازدا چ پاش ڕستەی سەرەکی بکەوێت و چ خستنەسەر بە کۆتایی وشەی دیارخراوەوە دەلکێت.

هێندێك وێنە بۆ ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بەبێ ئامرازی گەیەنەر، کە کەوتوونەتە دوای ڕستەی سەرەکێوە:

**لەگەڵیشیا بە حەسرەتەوە ئەیروانییە ئەو منداڵانەی تۆپێنیان ئەکرد.**

**ئەمەی وت و کەوتە سەیر کردنی ئەو شاخ و داخەی لەبەردەمیا کشابوو.**

چەند وێنەیەکی دی بۆ ڕستەی شوێنکەوتووی بەبی ئامرازی گەیەنەر، کە کەوتوونەتە نێو ڕستەی سەرەکێوە:

**ئەو کتێبەی لەناوچوو بەڕاستی زۆر بەکەڵك بوو.**

**ئەو شوێنانەی ئاویان نییە چاڵا و لیٚ ئەدەن.**

**ئەو زەوییەی درا بە جوتیارەکان لە دەربەگەکان سەنرایەوە.**

## ڕستەی شوێنکەوتووی بەرکاری

ڕستەی شوێنکەوتووی بەرکاری بەهۆی ئامرازی گەیەنەری (کە) وەیا بەبێ ئامراز بەرستەی سەرەکێوە دەگەیەندرێت.

**ئەو پێی وتم ، کە کووپەڵەکە لەناو لقی دارەکانا شاراوەتەوە.**

**ئەیزانی و دڵنیا بوو لەوە، کە زاتی ئەوەم نییە.**

وێنەی بۆ ڕستەی شوێنکەوتووی بەرکاری بەبێ ئامراز:

**دایك ئەڵێت تۆش زۆر ئێمەش خۆش ئەوێت.**

**هەر ئەوەم ماوە منداڵەکانم شوێنت کەون.**

**هیچ باوەڕناکەم دەربچی.**

## ڕستەی شوێنکەوتووی کات

ڕستەی شوێنکەوتووی کات بەیارمەتیی ئامرازی (کە، هەرکە، کاتێك کە، هەتا، لەدوای ئەوەی کە، لەپاش ئەوەی کە، لەپێش ئەوەی کە، هەرچەند) بەرستەی سەرەکێوە دەگەیەندرێت.

شوێنی ڕستەی شوێنکەوتووی کات لەنێو ڕستەی تێکەڵ دا بەم جۆرەی خوارەوەیە:

*أ) بەپێش ڕستەی سەرەکی دەکەوێت*

**کە ئەمانە هەموو کۆبوونەوە شێر ڕووی کردە ڕێوی.**

**کاتێك، کە باوکم کۆچی دوایی کرد، دایکم تەمەنی سیساڵ زیاتر نەبوو.**

**هەتا ماڵ خۆ دزی گرت، دز ماڵ خۆی گرت .**

*ب) دەکەوێتە نێو ڕستەی سەرەکێوە:*

ڕستەی شوێنکەوتووی کات، کە لەنێو ڕستەی سەرەکی دا دەبێت، دەکەوێتە دوای سەرکار وەیا وشەیکاری کات لەڕستەی سەرەکیدا.

**ئێواری، کە تاریك داهات هەموویان کۆبوونەوە.**

**جاری پێشوو کاتێك، کە لێرەدا ئەو ئاگایانەم بۆ ئەگێڕانەوە ئادەمزاێی لەو دیـوی دوڵیانەوە خۆی مات دابوو.**

*پ) بەپاش ڕستەی سەرەکی دەکەوێت.*

**لەسەر پردەکە دانیشە نانەکەت بخۆ، هەتا هاوڕێیەکت لێ هەڵکەوێ.**

**شەو تەواو تاریك بووبوو، کە پیاوێك لە پرێکا خۆی کرد بە ژوورا.**

**چاوم پێی کەوت کە لە بەغدا بووم.**

ڕستەی شوێنکەوتووی کات بە (لەگەڵ)یش دەست پێدەکات.

**لەگەڵ کوڕە ئەمەی ووت، پادشا یادی قسەکەی خۆی کەوتەوە.**

**لەگەڵ ئەمەم ووت، زەلامەکە هەستا و ڕایکرد.**

## ڕستەی شوێنکەوتووی ئامانج

ئامرازی گەیەنەری کە، هەتا، بۆ ئەوەی (کە) هاوبەشی پێکـهاتنی ڕسـتەی کەوتووی ئامانج دەکات، ئەم جۆرە ڕسـتەیەش هەمیشـە دەکەوێتـە دوای ڕسـتەی سەرەکێوە:

**گوێی مەدەرێ ئێوارە دێمەوە بۆ لات بۆ ئەوەی یارمەتیت بدەم.**

**خانووێکی باشیش ئەکرم، تا لەو دەردە سەری کرێ گرتنە ڕزگارمان بێت.**

**بەپێخواسی ئەڕۆم باشترە، هەتا خەو سەرنەکاتەوە سەرم.**

تێبینی دیاردە بەکارنەهاتنی ئامراز لەگەڵ رستەی شوێنکەوتووی ئامانج لەرستەی تێکەڵدا بکە:

**هاتوومە خزمەتت، چارێکمان بۆ ئەم زستانە بکەی.**

**دایکی نەختێ پارەی دابووێی شەکر و چای پێ بکرێت.**

## رستەی شوێنکەوتووی هۆیی

ئامرازی گەیەنەری (چونکە، چونکو، لەبەر ئەوەی کە) بەشداری گەیاندنی رستەی شوێنکەوتووی هۆیی بە رستەی سەرەکێوە دەکەن ، کە ئەم رستە شوێنکەوتووە بە وشەی یەکەمی ئەم ئامرازە گەیەنەرانە دەست پێ دەکات دەکەوێتە دوای رستەی سەرەکێوە، بەڵام کە بە وشەی دووەم دەست پێدەکات ئەوا دەکەوێتە پێش رستەی سەرەکێوە و ئەم وشانەشی لەگەڵدا بەکاردێت (بۆیە، بەو هۆیەوە):

**ئەم پارچە زەوییە من ئەناسێ، تەنیا من، چونکە من ڕەنجی لەسەر ئەدەم.**

**کەم جار بە تەنیا ئەبینرا، چونکە هەر ئەوەندەی بەچاو بکرایە مناڵە وردکە شوێنی ئەکەوتن.**

**لەبەر ئەوەی، کە باوکم هەتا دوا هەناسەی لە خزمەتی پاشای گەورەدا بوو، بەو هۆیەوە پاشا زۆر ئاگاداری و چاودێری ئەکردین.**

**لەبەرئەوەی، کە شەڕفرۆشە بۆیە رۆژ نییە بەیەکانەدەین**

## رستەی شوێنکەوتووی چۆنیەتی

رستەی شوێنکەوتووی چۆنیەتی بەیارمەتی ئامرازی گەیەنەری ( بێ ئەوەی (کە)) دادەرێژرێت:

**ئەمەی ووت وبی ئەوەی کە چاوەڕێی وەڵامی ژنەکەی بکا رۆیشتە دەرەوە.**

**رۆستەم بەهەر چوار لای خۆیدا ئەسووڕایەوە بێ ئەوەی بزانێ، چ بکات.**

## ڕستەی شوێنکەوتووی پلەیی وپێوان

ڕستەی شوێنکەوتووی پلەیی و پێوان بەیارمەتی ئامرازی گەیەنەری (ئاوەڵکاری) هێندە، ئەوەندە، بەرادەیەك (کە) دادەڕێژرێت و لەوانەشە لەنێو ڕستەی سەرەکیدا ئامرازی (هەتا)ی تێدا بەکاربێت:

**هێندە توورە بووبووم وەخت بوو گاکە وردوخاش کەم.**

**ئەوەندەم قسەکرد سەرم یشێت.**

**بەرادەیەك پێی ڕاهاتبوون و شارەزای بووبوون هەتا لە ترپەی پێش ئەیان ناسێوە.**

## ڕستەی شوێنکەوتووی *Concessive*

ڕستەی شوێنکەوتووی بەئامرازی گەیەنەری { هەر چەند (ە)} دەست پێ دەکات.

هەرچەندە کۆنە پۆلیس بوو، بەڵام بەکردەوە و ڕەفتار لە بەگزادەیەکی لێکەوتووی ئەکرد.

**پاشا هەرچەندە لەسەرەتاوە دوودڵ ئەبێ، بەڵام لە دواییدا ئەڵێ:**

**هەرچەندم ئەکرد و ئەکۆشام خەوم لێ نەئەکەوت.**

## ڕستەی شوێنکەوتووی مەرج

ڕستەی شوێنکەوتووی مەرج بە ئامرازی گەیەنەری (ئەگەر، هەر (کە) هەرچەندە، کە) دەست پێدەکات و بەشێوەیەکی گشتی ئەم جۆرە رستەیە دەکەوێتە پێش رستەی سەرەکێوە هەرچەندە هێندێك جار دەشکەوێتە دوای رستەی سەرەکییەوە، رستەی شوێنکەوتووی مەرج دابەش دەکرێتە سەر دوو جۆرە ڕستە.

لەرستەی شوێنکەوتووی مەرجی راستدا دەمکاتی کاری رستەکە رابردوو، رانەبردوو داهاتووی ئیخباری وەیا دەمکاتی رانەبردوو داهاتووی ئیلزامی دەبێت کاری رستەی سەرەکێش لەکاتی رانەبردوو و داهاتوودا دەبێت.

**ئەگەر بەڵێنمان ئەدەنێ دەست بۆ هیچ نەبەن، ئەوە ئەیان بەین.**

**بەخوا هەر ئەمکوژێت، گەر بزانێت لە خەڵکم وەرگرتووە.**

**کە پارەت دا مەلا لە مزگەوت دەرنەکەیت.**

ئەڵێن هەر هاوینێك زۆر گەرم بوو، ئەو زستانەی بەشوێنا دێت زۆر سارد ئەبێ.

لەم جۆرە رستەیەدا شێوەیەك بەرچاو دەکەوێت، کە کات پێشان دەدات و خێرا ڕووداني ڕووداوەکە دەگەیەنێت و کاری نێو ڕستەکە لە دەمکاتی رابردووی ئیلزامی دەبێت.

**هەرکە پیرێکی بدیبایە ڕووی گرژ ئەکرد و دڵی ئەگیرا.**

**مناڵە ووردکەی گەرەکیش هەر دەربکەوتایە بەسەرییا دائەبارین.**

جۆری دووەمی ڕستەی شوێنکەوتووی مەرج دەمکاتی کارەکەی رابردووی ئیلزامی دەبێت، لەو بارەدا دەمکاتی کاری رابردووی دووری ئیخباری لەنێو رستەی سەرەکیدا دەبێت:

**ئەگەر ئەو چاك بووایە، ئەمیش چاك ئەبوو.**

**پارەم ببووایە ژنێکم بهێنایە.**

ئەم جۆرە رستە شوێنکەوتووەی پێشوو لە باسکراودا لەوانەیە بەبێ ئامرازیش بێت.

کەچەڵ دەرمانکەر بووایە دەرمانی سەری خۆی ئەکرد.

## رستەی شوێنکەوتووی بەراوردکاری

ئامرازی گەیەنەری (وەکو، هەروەکو) هاوبەشی دارشتنی رستەی شوێنکەوتووی بەراوردکاری دەکەن و شوێنی ئەم جۆرە رستە شوێنکەوتووە هەمە چەشنە لەبەرامبەر رستەی سەرەکیدا:

ا) رستەی شوێنکەوتووی بەراوردکاری دەکەوێتە پێش رستەی سەرەکێوە:

منالە وەکو فێری زاڵە لێدان بوویێت خێرا دەستی بۆ لا ڕوومەتی بەرزکردەوە و بەگریانەوەووتی:

**لەپڕ وەکو شتێکی بەبیردا هاتبێت پەنجەکانی خستە سەر یەك بەنیازی ژمارەی شتێك.**

**دار هەرمێ یەك وەکو هەموو گەڵاکانی تەڕبوو.**

ب) پێوەندی بەراوردکاری بەبێ جیاوازی دەست نیشان دەکات (دەمکاتی کاری رستەکە رانەبردوو و داهاتوو رابردووی سادەی ئیخباری دەبێت بەرامبەر بە کاری رستەی سەرەکی، کە دەمکاتەکەی رانەبردوو دەبێت).

**برا گییان وەکو ئەبینی ئەم کوشك وسەرایە هی منە.**

**لای ئەو چا وەکو خۆی ئەیوت لەجێی هەموو شتێکە.**

## رستەی شوێنکەوتووی سەرکاری (نیهادی)

رستەی شوێنکەوتووی سەرکاری بۆی هەیە دابەش بکرێتە سەر دوو جۆر:

ا) ئەو رستە شوێن کەوتووە سەرکارییەی، کە بەرامبەر بە گوزارەی رستەی سەرەکی دەوری سەرکار دەگێرێت، ئەم جۆرە رستەی شوێن کەوتووە بە شێوەیەکی گشتی دەکەوێتە دووای رستەی سەرەکێوە و بەیارمەتی ئامرازی گەیەنەری ( ـ کە) پێی دەگەیەندرێت و لەوانەشە ئامرازەکە بەکار نەیەت.

**دیارەکە هیچت دەس نەکەوتووە.**

**لەوە ئەچوو جەرگ بڕی لیٚ قەومابێت.**

ب) رستەی رستەی شوێن کەوتووی سەرکاری رستەی سەرەکی ڕوون دەکاتەوە:

لێم ببورە، ئەمەی تۆ ئەفەرموی ڕیٚ ناکەویٚ.

ئەوەی، کە لە گۆمەکەش دا ئەبێنریٚ کووپەڵەکە نی‌یە، وێنەکەیەتی.

## رستەی شوێن کەوتووی گوزارەیی

رستەی شوێن کەوتووی گوزارەیی بە ئامرازی گەیەنەری (ـ کە) دەست پیٚ دەکات وەیا بەبیٚ ئامراز دەبێت و دەکەوێتە پێش وەیا پاش رستەی سەرەکێوە:

**ئاواتەخوازی ئەوە بوو، کە ڕۆژیٚ لەسەری بکەن.**

**ئەوەی چارەسەری تۆ ئەکات ئەمەیە.**

لەوانەیە لەرستەیەك دا کۆمەڵێك رستەی شوێن کەوتوو یەك لەدوای یەك دا بێن و بەهۆی ئامراز وەیا بەبیٚ ئامراز لێك بدرێن.

**هەرگەیشتەماڵەوە یەکسەر شالاوی بۆ ئەوە سووچەبرد، کە کتێبەکانی لیٚ دانابوو.**

کە ئەمە ئەڵیٚ ژنەکە ئەزانیٚ، کە ئەوە دایکی بووە.

شتێکی کەم لا سەیربوو، کە کچەکانیشیان ئەنارد بۆ خوێندن.

ئێمەش لە شارەکانا هەزار چەند و چۆن ئەکەین و فەلسەفە بە با ئەکەین، تا بزانین کوڕ و کچ پێکەوە بخوێنن باشە، یا بە جیا بخوێنن.

بەیانی‌یەك دووای بەرچاییکردن جوامێر بەلاوەی ووت، کەوا ئەیەوێت بچێت هەندیٚ قەوم و قیلەی بەسەر بکاتەوە کە ناویانی پیٚ وت بۆی دەرکەوت هەندێکیان مردوون و زۆریشیان ماڵیان لەشوێنی جارانی نەماوە.

ویستی قسەبکات گریان بەری گەرووی گرت، بۆیە سەری شۆرکرد و بێدەنگ ڕووی کردە ئەو ژوورەی بۆیان دانابوو.

# پەراوێزی نووسەر

١- زاراوەی (سۆرانی) لەم چەمکەی‌دا دیالێکتی موکری و سلێمانی دەگرێتەوە. جگە لەم دووانەش ئەو دیالێکتانەی، کە کەم لێیان کۆڵدراوەتەوە، وەك دیالێکتی (کرماشان و سنە و کەندولان و گاروس و هی دی لە کوردستانی ئێران دا بەر دیالێکتی خواروو دەکەون، کە وەکو دیارە نیمچە شێوە دیالێکتێکیان بۆ خۆیان پێك هێناوە. هەر بۆیە ئێمە لەم کارەمان دا زاراوەی (دیالێکتی ژووروو دیالێکتی خوارووی زمانی کوردی)مان بەکارهێناوە. لێرەدا پێویستە ئەوە بگوترێت، کەوا لەپاڵ زاراوەی (سۆرانی) دا زاراوەی دیالێکتەکانی نێوەراستیش بۆ هەمان مەبەست و مانا بەکاردێت، کە ئەم زاراوەیەی هەرە دوایی لەرووی دابەشکردنی جوگرافیێوە بۆ سەر (ژووروو، نێوەراست و خواروو) پەیدا بووە. (بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ١٨، ٢٤، ٢٩).

٢- ئێمە لەم کارەمان دا زاراوەی (گۆرانی) و (هەورامانی) بەکاردێنین، کە لە بریتی گۆرانی و هەورۆمانییە، چونکە ئەو شێوانەی ئێمە نووسیومانە زیاتر لەگەڵ یاسای گۆکردنیان دا ڕێکدەکەوێت.

٣- م. خال لە دابەشکردنی دیالێکتەکاندا، کە لە پێشەکی فەرهەنگە کوردی - کوردییە، سێ بەرگێکەی دایە، دیالێکتی گۆرانی و کەلهوری خستۆتە پاڵ گروپی کرمانجی خواروو.

٤- پێویستە ئەوە بگوترێت، کەوا ڕێککەوتنی نێوان دیالێکتی کرمانجی خواروو لەگەڵ دیالێکتی گۆرانیدا هەر لەو لایەنەدا نییە، کە د. ن. مەکەنزی باسی کردوون، بەڵکو ئەم ڕێککەوتنە زۆر لەوە فراوانتر، چونکە لەبواری سستێمی فۆنۆلۆژی ، کار ، جێناو و وشەی فەرهەنگیش دەگرێتەوە، بڕوانە (سەرچاوەی ژمارە ٣٩؛ ٦٣)

٥- ئەو بەڵگانەی دیم وەرنەگێرانە سەر زمانی رووسی، کە د. ن. مەکەنزی بە وێنە هێنابوونێوە، بۆ ئەوەی دیالێکتی زازا بە دیالێکتێکی زمانی کوردی دانەنێت.

٦- بۆ بەدیارخستنی دیالێکتی گۆرانی و زازا لەنێو دیالێکتەکانی زمانی کوردیدا بەهۆی پێوانەی زمانەوانێوە پێوستە ئەم راستیانەش بخرێنەڕوو، کە پێوەندی بە هەستی

تایبەتی خۆیان هەیە ئەویش ئەوەیە، کە گۆرانی و زازا خۆیان بەکورد دادەنێن و زمانەکەشیان بە کوردی لەقەڵەم دەدەن.

٧ـ لە دیالێکتی خوارووردا تایبەتێتیکی دیش سەبارەت بە ئامرازەوە هەیە، کە بەکارهێنان و لێکدانی لەگەڵ جێناوی نیشانەدا.

٨ـ ئێستە لەلایەن زازای کوردی تورکیا، لە سوید کۆڤارێکی ئەدەبی بەناوی (تیرێژ) دەردەچێت.

٩ـ ئەو بەڵگە نووسراوانەی ئەدەبی و ئاینی، کە بەگۆرانی نووسەراونەتەوە وا دەکەن لەگەڵ ناونیشانی بابەتەکەی نووسەر رێك نەکەون، کە گۆرانی بە دیالیکتێکی ئێرانی بێ نووسین لە قەڵەم داوە.

١٠ـ لە بەرهەمە چاپکراوەکانی سالآنی پێشتر ئەم ئەلفوبێیانە بەزۆری بەکارهاتوون.

١١ـ وێنەکانی دی نەنوسراون و تۆمار نەکراون.

١٢ـ لەبلآوکراوەکانی ئەمرۆدا هێندێك جار ئەم چەشنە نووسینە پێرەو ناکرێت و هەر لەیەك بابەت دا هەردوو جۆرە نووسین بەرچاو دەکەوێت.

* لەو ئەلفوبێیەی پێشان دراوە، کۆمەڵێك تیپ رێکخراوە، کە لەنێویدا (ئە، ئو، ئۆ، ئی، ئێ)یش بەپیتی سەربەخۆ داندراون و سەرەتاکانیان بە ( , , *e, u, o*) دەست پێکراون و لە دوای پیتی (ا، و، ی)ە هاتوون و لە دوای (ئا)، نەهاتوون و ئەمەش لەزۆربەی فەرهەنگە کوردێکاندا پێرەو کراوە.

** ئەوانەی لەنێو کەوانەدا داندراون شێوەی گۆکردنی پیتەکانی، کە لە سەرەتای وشەدا دەبن.

*** ت. وەهبی تێبینی دەنگی (ذ)ی کردووە، کە گۆکردنی کەوتۆتە نێوان دانەکانی، کە تایبەتە بە چەند هەرێمێکی وەك ناوچەی سلێمانی و کەرکوك و ئەردەلان (بروانە سەرچاوەی ژمارە ٨٥).

**** ئەگەرچی ئەم پیتە بەشێوەیەکی سەرەکی وەکو پێشگرێکی دەنگی بزوێنی درێژ دەژمێردرێت وا باشترە شوێنی لە کۆتایی تیپەکاندا بێت، ئەگەرچی هێندێک نووسەر دەیخەینە دوای تیپی (ا)ە.

١٣- نابێت لەگەڵ پێشنیازی ن. ع. ئەمین (بروانە سەرچاوەی ژمارە ٦٦ لاپەرە ٧١)دا رێك بکەوین، لەبارەی نووسینی پێشکری (بێ) کە لەگەڵ وشەدا دەبێت بەجیا ئەم دوو شێوە نووسینە بەراورد بکە (بی ناو) و (بێناو).

١٤- لە کاری لێکدراودا، کە بەشی ناو وەیا ئاوەڵاوەکەی دەوری کراوی (ئۆبێکتی) دەگێرێت پێویستە بەجیا بنووسرێت، ئەم دوو وشەیە بەراورد بکە: وەریان گرت - وەریان ئەگرێت.

١٥- لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ دەربارەی فۆنۆتیکی سلێمانی هەتا ئێستە نەکراوە. بۆیە ئەو فۆنێمانەی لێرەدا باسکراون بەشێوەیەکی سەرەتایین و لەو نووسینانە وەرگیراون، کە دەربارەی ئەم دیالێکتە نووسراون و هەروا نووسەریش خۆی بەگوێ گرتن تێبینی خۆی خستۆتە سەر.

١٦- لێرەدا تێبینی ئەوە دەکرێت، کە دەنگی قورگی ( ا ، ە) لە شێوەی ژووروودا (کرمانجی) کەمێك جیاوازی هەیە لەگەڵ هەمان دەنگ لە شێوەی خوارووودا وەك لەوشەی مار، تاری // تاریك، چەعف // چەف - چاو، تەل - تاڵ.

١٧- ئەم فۆنێمانە تایبەتێتیان لەنووسین دا جۆراوجۆرە: د. ن. مەکەنزی وەکو دەنگێکی گەروو سەیریان دەکات (بروانە ژمارە ٤٤ بەرگی - ١)، ئی. ن. مەکاروس دەنگی (پ و ك)ی بەرامبەر بە دەنگی (پی و کی) دادەنێت (بروانە سەرچاوەی ژمارە ٤٧)، ك. ك. کوردۆیف دەنگی پ، ت، ك بەدەنگی قورگی دانانێت، بەلام دەنگی پُ، تُ، كُ بە قورگی دادەنێت.

١٨- بە بەڵگەی ت. وەهبی ئەم فۆنێمە تایبەتە بە ناوچەی سلێمانی و کەرکوك و ئەردەلان (بروانە سەرچاوەی ژمارە ٨٥)، ئەم فۆنێمە لەلایەن ق. س. سۆکۆلۆڤەوە

لەشێوەی کرمانجی کوردانی تورکمانستاندا لێی کۆڵدراوەتەوە. (بروانە سەرچاوەی ژمارە ٢٠).

١٩ـ لەبەر ئەوەی ئەم ئامرازە کاریگەری هێز و ئاوازی وشەکەی پێش خۆی دەچێتە سەر، بۆیە لەکاتی نووسیندا لە نزیکی وشەکەی پێش خۆیەوە دەنووسرێت.

٢٠ـ ئەو شێوانەی جێناوی لکاو، کە لەنێو کەوانەدا داندراون لەگەڵ ئەو وشانەدا بەکاردێن، کە کۆتاییان بەبزوێن دێت.

٢١ـ لەدوای جێناوی لکاودا هەر تەنیا پاشبەندی ئامرازی پێوەندی بەکاردێت.

٢٢ـ هێندێك جار بەکارنەهاتن وەیا کەم کردنەوەی بەکارهاتنی جێناوی لکاوی کەسی دووەمی تاك بەچاو دەکەوێت:

خوا ئاگادار(ت) بێ

(لەشێوەی سلێمانیدا، کە جێناوی لکاوی کەسی دووەمی تاك لەنێودەچێت، لەبریتی ئەو دەنگی (و) بەکاردێت و شوێنی دەگرێتەوە بۆ وێنە ئەم رستەیەی نووسەر بەکاری هێناوە بەم جۆرە گۆدەکرێت : ***خوا ئاگادار و بێ*** - وەرگێر).

٢٣ـ هەروا لە ئەرکە سەرەکێکانی جێناوی لکاو (ـ ێ) پێوەلکانێتی بە کاری ناسادەی تێپەرەوە بۆ دەربرینی باری تیان (ناراستەوخۆ)، لەکاتی شیکردنەوەی شێوەکانی ئەم جۆرە کارە لێکدراوانە ئەم جێناوەی دەوری ئۆبێکت (کراو)ی تیان لەنێو رستەدا دەگێرێت: (لێی ئەسێنم)، لێمان سەندن)، کە لەچاوگی (لێ سەندن)ەوە وەرگیراوە (بۆ وەرگرتنی زانیاری زیاتر بروانە سەچاوەی ژمارە ٣٠).

٢٤ـ جێناوی لکاوی ( ـ ێ) بەدەگمەن دەوری کەسی سێیەمی تاك دەگێرێت، بۆ وێنە لەلێکدانی لەگەڵ کاری (گەیشتن)دا: ***کە گەیشتمێ.***

٢٥ـ جێناوی نیشانەی ***ئەو*** لەڕووی شێوەوە هەر بەجێناوی کەسی سێیەمی تاك (ئەو) دەچێت.

٢٦ـ جێناوی نیشانە، کە لەگەڵ ئامرازی پێوەندی بنجیدا لێك دەدات، شێوەکەی کورت دەکرێتەوە: بەم، بەو، لەم، لەو هتد.

٢٧- لەگەڵ ئامرازی (هەر)دا بەراوردی بکە، کە لەگەڵ رستەی شوێنکەوتووی کاتدا بەکار دێت.

٢٨- ئەم ئامرازانە لەشێوەی سلێمانیدا بەتەنیا بەکار نایەن.

٢٩- لەبەرهەمی وێژەیی کوردیدا ئەم ئامرازی بەپیتی بەستنەوە ناسراوە.

٣٠- لەگەڵ ئەم کارانەی، کە کۆتاییان بە پاشگری (- ەوە) هاتووە ئامرازی (- ە) لەنێو دەچێت.

٣١- کاری تێپەڕ بۆی هەیە ئۆبێکت (کراوی) سەربەخۆ، وەیا تیانی لەگەڵ دا بێت، یانیش هیچ کامێکیانی لەگەڵدا نەبێت.

٣٢- شێوەی دەمکاتی نادیار لەکاری تێپەر دادەرێژرێت.

٣٣- ئەو کارانەی لەسەرەوە رێزکراون شێوەی چاوگیان هەیە، ناوی کاری نادیاریان لێندراوە، نەك شێوەی نادیار لەنێو فەرهەنگ دا بە سەربەخۆ باسکراون.

٣٤- ئەم کارە واتای تێنەپەریش دەبەخشێت.

٣٥- هەر تەنیا یەك وێنە لەکاردا هەیە ئەویش - وون (چوون - چوواندن).

٣٦- لێرەدا بۆ ئەوەی دەچین، کەوا پاشگری باسکراو لەزۆر باردا واتای هۆی روودانی رووداو دەپارێزێت و بە یارمەتی (هێنان و خستن) دادەرێژرێت.

٣٧- لە کاری لێکدراودا نیشانەی کەسی جۆری دووەم دەکەوێتە نێوان کار و ناوەوە.

٣٨- لەگەڵ شێوەی ناکراوی کاری (هەبوون)دا یەك دەگرێتەوە.

٣٩- لە گەردانکردنی کاری (بوون)دا لەکاتی رانەبوردوودا شێوەی کەسی کاری پێوەندی وەیا کاری هەبوون بەکاردێت.

٤٠- لەم بارانەدا کاری هەبوون بەکاردێت.

٤١- لەم واتایەدا کاری بوون بە تەواوی گەردان دەکرێت.

٤٢- لەم ئەرکەیدا پاشگر کەمتر بەکاردێت (بوونەوە).

٤٣- کاری (ویستن) لە شێوەی کاتی نادیاریدا لێی دەربچێت، کە نیشانەی کەسی جۆری دووەمی لەگەڵ بەکاردێت، کە دەکەوێتە نێوان پێشگری (دە) (یان نا) و رەگی کاری:

| ئەمەوێ | ، | ئەتەوێ | ، | ئەیەوێ |
|---|---|---|---|---|
| ئەمانەوێ | ، | ئەتانەوێ | ، | ئەیانەوێ |
| نامەوی | ، | ناتەوێ | ، | نایەوێ // ناوێ |
| | | | | .وهی دی |

٤٤ـ ئەگەر کارەکە دارێژراو بوو، ئەوا ئەم پێشگری (بـ ـ)یە بۆی هەیە بەکار نەیەت: دا (بـ) خە، هەڵ (بـ)گرە و هی دی.

٤٥ـ ئەوانەی لەنێو کەوانەدا داندراون ڕەگی کاری ڕانەبوردوون.

٤٦ـ ئەم شێوەیە لەوانەیە لەڕووی شیکردنەوەوە لە کاری *ڕۆیشتن ـ بڕۆوە* وەرگیرابێت.

٤٧ـ بە هەبوونی (ڕ) لەنێوان ڕەگی کۆتایی هاتوو بە بزوێن و پاشگرەوە، بەراوردی بکە لەگەڵ *مەخۆرەوە*، *بڵێرەوە* و هەتا دوایی.

پەیدابوونی (ڕ) لەپێش لکاوی (ـ ێ) و ئامرازی لکاوی (ە)ش دا بەرچاودەکەوێت: بخەرە خوارەوە.

٤٨ـ ئەگەر لە ڕستەدا کراو (ئۆبێکتی) ڕووداو هەبوو، ئەوە جێناوی لکاو بەوەوە دەلکێت.

٤٩ـ شێوەی وەرگیراوی (هاتۆتە > هاتووەتە)یە.

٥٠ـ شێوەی ناراستی کاری بوونی بەلێکدانی لەگەڵ شێوەی کەسی سێیەمی تاکی کاری ڕابوردووی ئیلزامیو لەگەڵ بەکارهێنانی نیشانەی دەمکاتی کاری ڕابوردووی ئیخباری (د)ە.

٥١ـ ئەوەی لەم ڕستەیەدا تێبینی دەکرێت کاری تێنەپەری ترسان و لەرزین لەشێوەی کاری ڕابوردووی ئیلزامی دووردا وەکو کارێکی تێپەڕ بەرکاهاتووە، بەڵام نیشانەی کەسی کاری تێنەپەڕی پێوەلکاوە.

٥٢ـ ی. مەکاروس (٤٧ و ٦٤) و ت. وەهبی (٨٥، ١٧٣) ئەم شێوەیەی ئیلزامی تێبینی دەکرێت لە وێنەی کەوتبوومایە؛ بەڵام لەنێو کەرستەکانی ئێمەدا ئەم شێوەیە بەرچاو نەکەوت.

٥٣- هەروا شێوەی (بـ) کەوتبام (ایه)، (بـ) کەوتابامایە و بکەوتمایە تێبینی دەکرێت.

٥٤- لەکاتی نووسینی ئەم تیپە بە ئەلفوبێی عەرەبی لە شێوەی (نەء)دا دەبێت، بەواتا هەمزەی دەخرێتە کۆتاییەوە.

٥٥- ئامرازی لێکدەری (وە)بۆ لێکدانی دوو رستەی سادە بەکاردێت، کە لەئەنجامی لێکدانیاندا رستەی لێکدراوی پێوەست دادەرێژرێت، لەوانەیە بکەوێتە سەرەتای رستەیەکی سەربەخۆش (بەڵام لەدوای پنت وەیا فاریزەوە).

٥٦- ئەم جۆرە دارشتنە لەنێو زمانی قسەکردندا زۆر کەم بەکاردێت (بەشێوەیەکی سەرەکی لە نێو بەرهەمی زانستی و چاپەمەنیدا هەیە).

٥٧- ئەم کارانەش هەر سەر بەوانن:

دان، فرۆشتن گرتن، کردن، وتن، خواردن.

٥٨- رستەی تێکەڵ لەگەڵ رستەی شوێنکەوتووی هۆدا لەوانەیە وەکو رستەیەکی لێکدراویش لێك بدرێتەوە بەیارمەتی ئامرازی هۆییەوە.

## تێکستێکی کوردی

مانگی ئەو شەوە، جگە لەشەوان، ڕۆژگەورە و خڕ و زەردە وەکو زێڕ لە تاقی ئاسمان ئەدرەوشایەوە، ڕۆناکیە نەرمەکەی پەردەیەکی وەك ڕووی خۆی زەرد و هێمنی ئەخستە سەر زەمینی ئەو ناوە، هەر وەکو بڵێی پیرە پایز لە ڕێگای دا بەرەو زەوی، پێش ئەوەی گەڵا و سەرکەلی دار و درەخت زەرد بکات، ڕەنگی خۆی خستبێتە سەر مانگی ڕەنگین، ئەویش دووبارەی کردبێتەوە بۆ سەر زەمین. هەرکە بە ترس و لەرز لە هەورازەکەی ( گردی زەیتون ) سەرکەوتین ولە نوختەی پۆلیسی سێ ریانەکە و لە گۆڕستانەکە دەربازبووین و نەبووین، هەستم بە سەرماییێکی بێ ئەندازە کرد، کە لەگەڵ بای ئەو نیوەشەوی پایزە بە لوول هەڵمەتی بۆ دەم و چاو و لەشم هێنا. لەگەڵی گرژ بووم. وە دەماری لەشم کشت بوون. شوورکە دارەکەم لەدەست تێ هەڵدا و هەردوو دەستم خستە ناو باخەڵم. سەرم دانەوان و هەنگاوم ڕائەنا. تا کاتێك خامۆش بووم و لەدونیای ئەم لا و ئەو لام ئاگام لە چ شتێك نەما، کڕ وەك پەیکەرێکی دار بە جۆرێکی ئالی لنگەکانم هاتو چۆیان ئەکرد، وە بۆ پێشەوەیان ئەبردم. چاوم ئەوەی بەدی ئەکرد، تەنیا سێبەری دایکم بوو، کە وەك جنۆکە لەسەر جادەکەم هەڵئە پەڕی و ئەجووڵایەوە، جارجارەش، کە کەرەکە سەری ڕائەوەشاند گوێم لە فڕمەی لووت و لەقە لەقی گوێیە درێژەکانی ئەبوو، هەر ئەمەندە و بێدەنگ لەدونیای ئەو نیوەشەوە نقووم ئەبووم.

# سەرچاوە


1. Абдуррахман Хаджи Маруф. История курдской лексикографии и принципы составления русско-курдского словаря. Автореф. канд. дис. Л., 1972.
2. Бакаев Ч.Х. Говор курдов Туркмении. М., 1962.
3. Ибрагим Азиз Ибрагим Хаджи. Сложноподчиненное предложение с придаточным определительным в центральных диалектах курдского языка. Автореф. канд. дис. М., 1975.
4. Курдистан Абдул Рахман Латиф. Определение и способы выражения определительных отношений в курдском языке (диалект сорани). Автореф. канд. дис. М., 1976.
5. Курдоев К.К. Курдский язык. М., 1961.
6. Курдоев К.К. Категория рода и объектная конструкция в заза. — Иранское языкознание. М., 1976.
7. Курдоев К.К. Грамматика курдского языка на материале диалектов курманджи и сорани. М., 1978.
8. Курдоев К.К. Исследования заза (курдская диалектология) (рукопись).
9. Курдоев К.К., Юсупова З.А. Курдско-русский словарь сорани. М., 1983.
10. Лазарев М.С. Курды и курдский вопрос. — "Азия и Африка сегодня". 1983, № 12.
11. Маккензи Д.Н. Курманджи, курди и гурани. — "Народы Азии и Африки". 1963, № 1.
12. Мухамед Фарук Омар Садык. Именное словообразование в литературном языке курдов Ирака. Автореф. канд. дис. М., 1977.
13. Опыт историко-типологического исследования иранских языков. Т. 1. М., 1975.
14. Пирейко Л.А. Основные вопросы эргативности на материале индоиранских языков. М., 1968.
15. Руденко М.Б. Курдская литература XVII века. — "Народы Азии и Африки". 1971, № 3.
16. Смирнова И.А. Образование сложных глаголов в южном диалекте курдского языка (сорани). Автореф. канд. дис. М., 1964.
17. Смирнова И.А. О характере спряжения переходных глаголов в прошедшем времени в курдских диалектах центральной группы. — Эргативная конструкция предложения в языках различных типов. Л., 1967.
18. Смирнова И.А. Формы числа имени в иранских языках. Л., 1974.
19. Смирнова И.А., Эйюби К.Р. Морфологическая структура слова в курдском языке (глагол и существительное). — Морфологическая структура слова в индоевропейских языках. М., 1970.
20. Соколова В.С. Новые сведения по фонетике иранских языков.- Иранские языки. 2. М.-Л., 1950.

21. Хазнадар М. Очерк истории современной курдской литературы. М., 1967.
22. Хайдари Джамшид Хайдар Ассим. История развития современной курдской художественной прозы в Ираке (1925-1960 гг.). Автореф. канд. дис. М., 1979.
23. Хамоян М.У. К истории изучения заза. – Вопросы фразеологии, стилистики и грамматического строя восточных языков. Самарканд, 1972.
24. Цаболов Р.Л. Очерк исторической фонетики курдского языка. М., 1976.
25. Цаболов Р.Л. Очерк исторической морфологии курдского языка. М., 1978.
26. Цукерман И.И. Очерки курдской грамматики. – Иранские языки. 2. М.-Л., 1950.
27. Цукерман И.И. Очерки курдской грамматики. Глагольные формы курманджи. М., 1962.
28. Эйюби К.Р. Творчество современного прогрессивного курдского поэта Хажара. Автореф. канд. дис. Л., 1963.
29. Эйюби К.Р., Смирнова И.А. Курдский диалект мукри. Л., 1968.
30. Юсупова З.А. Предлоги и послелоги в южном диалекте курдского языка (сорани). Автореф. канд. дис. Л., 1965.
31. Юсупова З.А. Энклитические местоимения в структуре предложения (на материале курдского языка). – ППиПИКНВ. 13, 1977.
32. Юсупова З.А. Синтаксические функции энклитических местоимений в курдском языке. – ППиПИКНВ. 14. Ч. 2, 1979.
33. Юсупова З.А. Изафетные конструкции в сулейманийском диалекте курдского языка. – Иранское языкознание. Ежегодник. 1980. М., 1981.
34. Юсупова З.А. Морфологические функции энклитических местоимений в курдском языке. – ППиПИКНВ. 15. Ч. 1, 1981.
35. Юсупова З.А. Конструкции с пассивными глаголами. – ППиПИКНВ. 16. Ч. 1, 1982.
36. Benedictsen M. Les dialektes d'Awromān et de Pāwa, revus et publiés avec des notes et une esquisse de grammaire par A.Christensen. København, 1921.
37. Blau J. Manuel de kurde (Dialecte Sorani). P., 1980.
38. Chodzko A. Études philologiques sur le langue kcurde (dialecte de Solĕimanié). – JA. T. 9. P., 1857.
39. Christensen A. und Barr K. Iranische Dialectaufzeichnungen aus dem Nachlass von F.C.Andreas. B., 1939.
40. Edmonds C.J. Some Developments in the Use of Latine Character for Writing of Kurdish. – JRAS. July 1933.
41. Edmonds C.J. Prepositions and personal Affixes in Southern Kurdish. – BSOS. Vol. 17. P. 3. L., 1955.
42. Fossum L.O. A Practical Kurdish Grammar. Minneapolis, 1919.
43. Mackenzie D.N. The Origins of Kurdish. – Transactions of the Philological Society. L., 1961.
44. Mackenzie D.N. Kurdish Dialect Studies. Vol. 1–2. L., 1961–1962.
45. Mann O.–Hadank K. Mundarten der Gûrân. – Kurdisch-Persische Forschungen. Abt. 3. Bd 2. B., 1930.
46. Mann O.–Hadank K. Mundarten der Zâzâ. – Kurdisch-Persische Forschungen. Abt. 3. Bd 4. B., 1932.

47. M c C a r u s E.N. A Kurdish Grammar. Descriptive Analysis of the Kurdish of Sulaimaniya. N.Y., 1958.
48. M o k r i M. Bîžan-u-Manîja. Version populaire du Sud du Kurdistan. P., 1966.
49. M o k r i M. Contribution scientifique aux études iraniennes. P., 1970.
50. M o r g a n J. Dialectes kurdes, langues et dialectes du Nord de la Perse. — Etudes linguistiques de la mission scientifique en Perse. T. 5. P., 1904.
51. M u k r î y a n î G. Elif u bêy kurdî wênedar be tîpî latînî. Be zarawekanî Soranî, Badînî, Feylî, Hewramî. Hewlêr, 1972.
52. S o a n E.B. Grammar of the Kurmanji or Kurdish Language. L., 1913.

**بابەتی ڕێزمانی**

٥٣– بەکر دلێر. ئەشکەوتەکەی گوندوك. بەغدا، ١٩٥١.

٥٤– تاهر سادق، ڕێنووس، چۆنیەتی نووسینی کوردی، بەغدا، ١٩٦٩.

٥٥– تەوفیق وەهبی دەستووری زمانی کوردی، بەغدا، ١٩٢٩.

٥٦– ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی، بەغدا، ١٩٧٦.

٥٧– ڕێنووسی کوردی - گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، بەغدا ١٩٧٣.

٥٨– زاراوە زانستییەکان. دانان و لێکۆڵینەوەی لیژنەی زاراوە زانستییەکان، بەغدا، ١٩٧٦.

٥٩– زاراوی هەمەچەشنە. دانان و لێدوانی ئەنجومەنی کۆڕ و لیژنەکانی، بەغدا، ١٩٧٣.

٦٠– فؤاد حەمە خورشید. اللغة الكردية. بغداد، ١٩٨٣.

٦١– سعید صدقی. مختصر صرف و نحوی کوردی. بەغدا، ١٩٢٨.

٦٢– محمد امین هەورامانی. فۆنەتیکی زمانی کوردی. بەغدا، ١٩٧٤.

٦٣- محمد امين هەورامانی. ڕێزمانی کوردی. سۆرانی و هەورامانی، بەغدا، ١٩٨٢.

٦٤- مەسعود محەمەد. چەند حەشارگەیێکی ڕێزمای کوردی، بەغدا، ١٩٧٦.

٦٥- نوری عەلی ئەمین. قەواعدی زمانی کوردی، بەغدا، ١٩٥٦.

٦٦- نوری عەلیی ئەمین. ڕابەرێ بۆ ئیملای کوردی، بەغدا، ١٩٦٦.

٦٧- نەسرین فەخری. چاوگی بی واتا لەزمانی کوردیدا، بەغدا، ١٩٧٣.

٦٨- ئەورەحمانی حاجی مارف. ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (مۆرفۆلۆژی)، بەغدا، ١٩٧٩.

٦٩- جەمال ەبەز. زمانی یەکگرتووی کوردی، بامبێرگ، ١٩٧٦.

**فەرهەنگ**

٧٠- حەمیدی ئێزەد پەنا و مەحموود زامدار. فەرهەنگی لەك و لوڕ، بەغدا، ١٩٧٨.

٧١- عبدالرحمن امین زەبیحی. قاموسی زمانی کوردی، بەغدا، بەرگی یەکەم ١٩٧٧، بەرگی دووەم، ١٩٧٩.

٧٢- علاء الدین سجادی. دەستوور وەفەرهەنگی زمانی کوردی - عەرەبی - فارسی، بەغدا، ١٩٦٢.

٧٣- گیو موکریانی. قاموسی مهاباد، هەولێر، ١٩٦١.

٧٤- معروف قەرەداغی مەردۆخی. فەرهەنگی کشت و کاڵ. بەغدا، بەرگی یەکەم ١٩٧٢، بەرگی دووهەم ١٩٧٣.

٧٥- فەرهەنگی خاڵ. سلێمانی، جزمی یەکەم ١٩٥٩، جزمی دووەم ١٩٦٤، جزمی سێهەم ١٩٧٦.

## دیوان و لێکۆڵینەوە

٧٦– دیوانی جەفایی، بەغدا، ١٩٨٥.

٧٧– دیوانی ڕەنجووری، بەغدا، ١٩٨٣.

٧٨– دیوانی صەیدی هەورامی، سلێمانی، ١٩٧٥.

٧٩– دیوانی مەولەوی، بەغدا، ١٩٦١.

٨٠– شیرین و خوسرەو. خانای قوبادی، بەغدا، ١٩٧٥.

٨١– علاء الدین سجادی، ئەدەبی کوردی، بەغدا، ١٩٥٧.

٨٢– عیزەدین مستەفا ڕەسوول. زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی، بەغدا، ١٩٧١.

٨٣– وەلی دێوانە. ژیان و بەسەرهات و هۆنراوەی، بەغدا، ١٩٧٦.

84- Mann O. Die Mundart der Mukr Kurden. Kurdisch Persische Forschungen. Abt .4. Bd3. T.1.B., 1906. T.2.B., 1909.

85- Wahby T., Edmonds C.J.A Kurdish- English Dictionary. Ox., 1966.

## ئەو سەرچاوە سەرەکییانەی کەرەستەی وێنەکانی لێ وەرگیراوە

٨٦– چیرۆکەکانی مەم. بەغدا، ١٩٧٥.

٨٧– دیوانی سەلام. بەغدا، ١٩٥٨.

٨٨– ڕۆژی نوێ، ژمارە ٢، سلەیمانی ١٩٦١.

٨٩– علاء الدین سجادی، ڕشتەی مرواری، بەغدا، بەرگی ١–٢ ، ١٩٥٧، بەرگی ٣، ١٩٥٨.

٩٠– کاوس قەفتان. ١٥ چیرۆك، بەغدا، ١٩٦٩.

٩١– محمد خاڵ، پەندی پێشینان، بەغدا، ١٩٥٧.

٩٢– محمد کریم شریف. فۆلکلوری هۆنراوەکانی کوردەواری، کەرکووك ١٩٧٤ .

٩٣– نوری عەلی ئەمین، ڕێزمانی کوردی، بەغدا، ١٩٦٥.

٩٤- نووسەری کورد، بەغدا، ١٩٧١، ژمارە ٢.

٩٥- نووسەری کورد بەغدا، ١٩٧٢، ژمارە ٥.

٩٦- نووسەری کورد، بەغدا، ١٩٨١، ژمارە ٦.

٩٧- هیوا، بەغدا، ١٩٦١، ژمارە ٣٣.

٩٨- ئیبراهیم ئەحمەد. ژانی گەل، سلێمانی، ١٩٧٢.